# پێشمەرگەی ئیسلام

نووسینی : علی باپیر

١٤٠٨ ك ـ ١٩٨٨ ز



لە بڵاوکراوەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی

پێشکەش بێ

بەو پێشمەرگە پارێزکارو جەرگدارانەی

کە بە قسەو وتارو کردەوەو ئاکارو سەرو

سیمایان دەیسەلمێنن کە پێشمەرگەی

ئیسلامن و شوێن کەوتووی قورئان و قوتابی

پێغەمبەرانن .

پێشەکی

خوێنەوری بەڕێزو خۆشەویست !

خوای بەرزو مەزن پشتیوان بێ لەم نامیلکەیەدا هەوڵ دەدەین بەکورتی وپوختی لە چەند خالێك دا پێشمەرگەی ئیسلامت پێ بناسینین، بۆئەوەی ئەگەر پێشمەرگەی ئیسلام بی تێبگەی کەدەبێ چۆن بی تاکو لە ئیسلام بوەشێیەوەو بگونجێ پێت بگوترێ ( پێشمەرگەی ئیسلام ) ، وە ئەگەر پێشمەرگەش نەبی یان پێشمەرگەبی بەلام پێشمەرگەی ئیسلام نەبی، بۆت دەرکەوێ کە پێشمەرگەی ئیسلام کێیەو چۆنە ؟! تاکو لە ناسینی پێشمەرگەی ئیسلامدا بەهەڵەدا نەچی و دووەمڵ بە بەز حالێ نەبی !!

هەڵبەتە بەڵگەنەویستیشە کە ئیسلام هەروەك چۆن لەهەموو بوارێك دا هەڵوێستی تایبەتی و سەربەخۆی هەیەو لەهەموو ڕێچکەو بیردۆزە دەستکردەکان جوێ یە، پێشمەرگەیەکیش کە ئیسلام دەی ڕەخسێنێو باری دێنێ، پێشمەرگەیەکی تایبەتیو

هەلبژاردەو دانسقەیەو لە هەموو شتێك دا لە غەیری خۆی جوێ یەو خاوەنی کەسایەتی یەکی سەربەخۆو تایبەتی یە ئنجا لە حالێکیش دا باپیاک بەدرۆو بەناهەق خۆی بە پێشمەرگەی ئیسلام لەقەڵەم بدات و لێشی نەوەشێتەوەو رێ ی نەکەوێ پێشمەرگەی ئیسلام بێ ئەوە بێگومان دەریا بەزاری سەگ پیس نابێو کوردانیش گوتویانە ( مەیدانێ درۆیە کورتە ) !! (١) وە حەتمەن حەتمەن بە شەنەو سێلکەی خەبات و تێکۆشان و لەنێو کەوو بێژینگی جمو جووڵو چالاکیان دا کاودانو گەنمو زیوان لێك جوێ دەبنەوەو دەکەونە گورێ! عارەبیش لەوبارەوە گوتوویانە :

سوف تری اذا انجلی الغبار

أفرس تحتك أم حمار !!

واتە: لەمەودوا کاتێك تۆزوخۆڵو تەمو مژ

(١) لە گوفارێك دا کە دەستەیەکی بەناو ( ئیسلامی ) دەری دەکەن نووسراوە پێر ی ئیمە ( حازرە لەگەڵ دوژمنانی خوداش دا .. هاوکاری بکا بو رزگاری کوردستان ) !! هەڵبەتە ئەم قسەیە ئەگەر باپیاکەسی نەتەوەپەرست بیکات پڕ بە پێستی خۆیەتیو

لێ دەوەشێتەوە چونکە بابایەکی ئەوتۆ
( کوردو کوردستانی ) ی لێ بوونە بەست و
سەنەم و لەباتی خودا دەیانپەرستی و ئامانجی
مەبەستی چەکداری و هەوڵ و خەباتیشی بۆ
بووژاندنەوەی ئیسلام و چاك کردنەوەی ڕێ و
شوێنی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نیە
بەڵام بابایەك خۆی بە مسوڵمان لەقەڵەم
بدات و لافی ( ئیسلامی ) بوون لێ بدات ئەگەر
عەقڵ و لێکدانەوەی هەبێ و ئاگای لەم ئایەتە
هەبێ کە دەفەرموێ :

( یا ایها الذین امنوا لاتتخذوا عدوی
وعدوکم اولیاء تلقون الیهم بالمودة وقد
کفروا بما جاءکم من الحق .. ) الممتحنة/١
واتە : ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە
دوژمنی من و دوژمنی خۆتان مەگرن بەدوست
چۆن دەبێ شێوە خۆشەویستی یتان لەگەڵیان
هەبێ لە حاڵێك دا کە ئەوان سەبارەت بەو
هەق ـ بەرنامەو پەیڕەوەی کە لەلایەن
خوداوە ـ بۆتان هاتوە کافرن !!

قسەو بیرو بۆچوونی وای لێ چاوەڕوان
ناکرێ و نەدەبوو وا بە پێخواسی وەنێو
چەقڵی و چاڵی هەڵەو پەلان بکەوێ .

هەڵبەتە ئەم تاملکەیەش وێڕای ئەوەی
کە پێشمەرگەی ئیسلام لە ئاوێنەی ڕوونی
قورئان و سوننەت دا دەخاتەڕوو و ڕادەنو
ـ ێنی کەسانێکی گەجەرو گوجەرو بێکاکڵو
جەوهەریش کە بەساختەو درۆ دروشمی ئیسلا
ـ میان بەرزکردۆتەوەو بەرەفتاری چەوتیان
زۆرکەسیان لەئایین ڕەواندۆتەوە بە شەنەو
بێژینگی شەرع خلتەوخاڵی و سەرکوێزری یان
دەسەلمێنێ .

وشەی ( پێشمەرگە ) وشەیەکی بەرزو پیرۆزە ، چونکە لە سەرەتای دەست پێکردنی جموجووڵ و شۆڕشی ئازادیخوازانەی گەلی کوردی مسوڵمانەوە دا هێنراوەو ، وشەیەکی پڕ بە پێستیشە بۆ نیشتمان پەروەرو گەل پەروەرەی کە ئامادەیە سەروماڵی خۆی بەخت بکات لەپێناوی ئازادی و رزگاری گەلە - کەی دا ، پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی : ( خيركم المدافع عن عشيرته مالم يأثم ) رواه ابوداوود .

واتە : چاکترینتان ئەو کەسەیە کە لەسەر هۆزەکەی دەکاتەوە بەمەرجێك بێشەرعیی نەکات . وە وشەی پێشمەرگە وشەیەکی لێکدراو ( مرکب ) ەو لە وشەی ( پێش ) وە ( مەرگ ) پێکهاتوە ، واتە : ئەوکەسەی کە مەرگی خۆی وەپێش دەخات یان مەرگی خۆی پێش کەش دەکات .

---

(١) بێگومان پێشمەرگەی مسوڵمان ( مسوڵمانی کامڵ) ە ، کەواتە بۆ چاکتر ناسینی پێشمەرگەی ئیسلام و مسوڵمان پێویستە کتێبی ( مسوڵمانی کامڵ) بەوردی موتالا بکرێ .

بەس یەك مانای ڕاست هەڵدەگرێ ؛ ئەویش ئەوەیە کە پێشمەرگەی ئیسلام کەسێکە کە مەرگی خۆی ڕەپێش مەرگی ئیسلام دەخات یان مەرگی خۆی پێشکەش ئیسلام دەکات .

بەڵی لەڕوانگەی ئیسلامەوە تاقە شتێك کە لەوە بوەشێتەوە ئینسان خۆی بەقوربانو بەلاگێری بکات و سەری لەپێناودا دانێ بەس خودا و بەرنامەی خودایە دەنا مرۆڤ جگە لە خودا و بەرنامەکەی لەپێناوی هەر شتێکی کەدا بڕوات خەسارە دەبێ ! چونکە لەخودا بترازێ هەرچی - لە ئاسمانەکانو زەوی دا - هەیە بۆخاتری مرۆڤ دروستکراوە

هەڵبەتە ئەمەی گوتیشمان ئەوە ناگەیە - نێ کە پێشمەرگەی ئیسلام لەسەر نیشتمانو نەتەوەکەی وەدەنگ نایەت و دژی ستەمو زۆرو بێ دادی ناوەستێو لەسەر چەوساوان ناکاتەوە !!

چونکە ئایین و بەرنامەی خوا بۆیە هاتوە کە دادگەری و یەکسانیو ئازادی بچەسپێنێو ڕەگ و ڕیشەی ستەمو چەوساندنەوەو بێ دادی لەبن بێنێ هەڵبەتە هەموو

ئینسانێکیش پێویسته یەکەمین هەنگاوی لە خۆیەوە دەست پێ بکات و لەپێش دا چارەی دەردی خۆی بکات، وەک خودا بە پێغەمبەری پێشەوای فەرمووە: (وانذر عشیرتک الاقربین) الشعراء/ ٢١٤. واتە: وە تیرەو هۆزە نیزیکەکەت ئاگادار بکەوە.

بەڵێ پێشمەرگەی ئیسلام لە هەموو کەس پتر لەسەر گەل و نیشتمانەکەی دەکاتەوەو هەوڵ دەدات کە نیری ستەمکاری لەسەر ملی گەلەکەی لاببات و، وڵاتەکەی لە دوژمن دا گیرکەرو چەوسێنەر پاک بکاتەوە، بەلام جیاوازی بنەرەتی لەنێوان پێشمەرگەی ئیسلامو پێشمەرگەی رێچکەو بیردۆزەکان دا ئەوەیە، کە پێشمەرگەی ئیسلام بۆیە هەوڵی ئازادی نیشتمان و رزگاری نەتەوەکەی دەدات، چونکە خودا فەرمانی پێ کردووە بەبێ وڵاتێکی ئازادو گەلێکی سەربەخۆش ناگونجێ ئایین و بەرنامەی خودا بچەسپێ!!

بەکورتی: پێشمەرگەی ئیسلام کەسێکە کە مەرگی خۆی رەپێش ئیسلام دەخات و خۆی لە رێ ی خوادا بەخت دەکات، ئنجا یەکسەر

لە یاساکانی ئیسلامو یەکێك لە فەرمانەکانی خودا ئەوەیە کە ئینسان لەسەر گەل و نیشتمانی بکاتەوەو دژی داگیرکەرو چەوسێنەر بجەنگێ .

لە خالّی دووەمیش دا زیاتر تیشك داوێینە سەر ئەم مەسەلەیە .

خالّی دووەم . پێشمەرگەی ئیسلام ئامانجی چیە؟!

خوای زانا کە باسی برادەرە بەرێزەکانی پێغەمبەر صلی اللە علیه وسلم دەکات خوا لێیان رازی بێ، دەفەرموێ : ( یبتغون فضلا من اللە ورضوانا ..) الفتح/ ٢٩ . واتە : بەخشش و رەزامەندی ی خوا داوادەکەن ،

جا لەراستیدا ئامانج و مەبەستی هەموو مسولّمانێك بریتییە لە وەدەست هێنانی بەخشش و رەزامەندی ی خوا ، پێشمەرگەی ئیسلامیش کە نەك هەر مسولّمانە بەلّکو مسولّمانێکی کاملّیشەو دیارە ئەویش هەر هەمان ئامانج و مەبەستی هەیە .

بەلاّم لێرەدا مەسەلەیەك هەیە زۆرکەس تێیدا بەهەلّەدا چووەو هەوجێی روونکرد

- نەوەو توێژینەوەیە ؛

ئەویش ئەوەیە کە وشەی ( ئامانج ) و ( بەرهەم ) یان ( هاندەر ) و ( ئەنجام ) تێکەڵ دەکەن و وەک چێشتی مجێوری لێکیان دەدەن و فەرقیان پێ ناکەن .

بەڵام لەراستیدا هەرکام لە ( ئامانج - هاندەر ) وە ( بەرهەم - ئەنجام ) هێندەی ئاسمان و زەوی لێک دوورن ! چونکە ئامانج یان هاندەر ئەو شتەیە کە دەبێتە بزوێنەرو پاڵنەری ئینسان بۆ جووڵان و کارکردن ، بەڵام بەرهەم یان ئەنجام ئەوە میوەو دەستکەوتێکە کە بەهۆی جووڵان و کارکردنەوە وەدەست دێ .

جا ئامانج و مەبەستی پێشمەرگەی ئیسلامو ئەو پاڵنەرو هاندەرەی کە وای لێ دەکات خۆی بەخت بکات و ڕەنج بدات و ئارەقو خوێن خەرج بکات بریتیە لە خولیاو هیواو ئاواتی گەیشتن بە ڕەزامەندی خوداو بەهەشتی بەرین .

بەڵام ئەو بەرهەمو دەستکەوتەی کە پێشمەرگەی ئیسلام وەدەستی دێنێ لە ئەنجامی خەبات و تێکۆشان و ڕەنج دانی دا

ئەوە بریتییە لە لابردنی زوڵـــم و زۆرو چەوساندنەوە و چینایەتی و بێـــیی دادی و چەسپاندنی دادگەری و یەکسانی و ئــازادی لەپێشدا لەنێو نەتەوەی خۆی . و نیشتما نی خۆیدا و ئنجا لە باقی پارچەکانــی دیکەی سەرزەوی دا .

بەکورتی پێشمەرگەی ئیسلام هیــــوا و ئاوات و ئامانج و مەبەستی بووژاندنەوەی ڕێ و شوێنی پێغەمبەرو هێنانەوەی ئیسلامە و تا قە شتێك کە وای لێ دەکات خۆی بەخــت بکات وەدەست هێنانی ڕەزامەندی خــودا و پاداشتی نەبڕاوەیەتی بەهۆی هەــوڵ و خەبات و تێکۆشانییەوە لەپێناوی بــەرز کردنەوەی ئاڵای ئیسلام و هێنانەوەی کایــەی یاسا و دەستوورەکانیدا ، ئنجا بەرهــەم و ئەنجامێك کە لەسۆنگەی ئەو هــــەوڵ و خەباتەیەوە کە دەیکات پێی دەگات، بریتیە لە لابردنی ستەم و زۆرو چەوساندنـــەوە و بێ دادی و هێنانەدی خێرو خۆشی و دادگەری و یەکسانی و ئازادی .

لەم بڕە توێژینەوەیەشەوە دەگەینــــە ئەنجامێکی گرنگ :

ئەویش ئەوەیە کە بەئامانج گەیشتنــی پێشمەرگەی ئیسلام بە پێچەوانەی غەیــری خۆیەوە هەموو دەمێ مسۆگەرە بەرهــەمو ئەنجام وەدەست بێنێ یان نا !! چونکـــە ئامانج و مەبەستی پێشمەرگەی ئیســــلام لە جوغزی ئەم ژیانە دنیاییەدا نیــەو بە وەدەست هێنانی بەرهەمو دەست کەوتــە ـ کانیشییەوە پەیوەست نیە !!

بەلام پێشمەرگەی غەیری ئیسلام لەبەر ئەوەی جگە لە مەبەستە دنیاییەکــان ئامانج و مەبەستێکی دیکە شك نابات، هەر کاتێك نەیتوانێ دەست بگەیەنێتە ئــەو ئامانج و مەبەستانە کە پێشمەرگەی ئیسلام بەئەنجامو بەرهەمیان دەزانێ، مانــای وایە بەئامانج نەگەیشتوەو ڕەنج بــــە خەسارو دەسخەڕۆ بووە !!

لەکوتایی ئەم باسەدا ئایەتێکــــی قورئان دێنینەوە کە هەرکام لە ئامانج و بەرهەمی هەوڵ و تێکوشانی پێشمەرگــەی ئیسلامی کۆکردوونەوە خودا فەرموویەتی :

( وما لكم لا تقاتلون فی سبيل اللـــــه والمستضعفين ...؟!) النسا ٤/ ٧٥ ٠ واته؛ ئەوە بۆچی لەرێی خوا و چەوساوانـــدا ناجەنگن ...؟!

ئاشکرایە کە جەنگ کردن لەرێی خوادا مەبەست بەرزکردنەوەی ئالاّی ئیسلام و چەسپا ندنی یاسا و دەستوورەکانی یەتی، ئەمەش ئامانج و مەبەستی پێشمەرگەی ئیسلامـــە وە جەنگ کردن لەپێناوی چەوساوانـــدا مەبەست قوتارکردن و رزگارکردنیانە لـــە دەستی چەوسێنەران، دیارە ئەمەش میوەو بەرهەمی درەختی (جیهادی ئیسلامی) یە ٠ ماندام وابێ شیلەو کاکڵی ئەم باســـــه ئەوەیە:

ئامانج و مەبەستی تێکوشانی پێشمەرگـ ـەی ئیسلام بووژاندنەوەی ئیسلامە و ئەنجا ـمو بەرهەمی ئەو تێکوشانەش لابردنـــی ستەمو چەسپاندنی دادگەری و رزگـــار کردنی چەوساوانە ٠

خالّی سێیەم : پێشمەرگەی ئیسلام لەبواری
خواپەرستی دا

وەك لە بەشی دووەمی کتێبی ( مسوڵمانی کاملّ ) دا خستوومانەتەروو هەموو جم و جووڵ و چالاکییەکانی مرۆڤی مسوڵمان بە خواپەرستی ( عبادە ) لەقەلّەم دەدرێن بەمەرجێك خوا مەبەست بوون ( الاخلاص ) و بەپێی سوننەت بەرێوەچوونیان لەگەڵ دا بێ، کەواتە خواپەرستیی لەروانگەی پێشمەرگەی ئیسلامەوە بەس بریتی نییە لە نوێژوڕۆژوو و زەکات و حەج و ذیکر بەڵکو ئەمانە درووشم و هێلّە سەرەکییەکانیو خواپەرستی دەرودەروون ( ظاهر وباطن ) ی مرۆڤ و وردو درشتی ژیانیو هەموو لایەنەکانی ئیسلام دەگرێتەوە .

جا ئێمە لەبەر ئەوەی سوپاس بۆخوا لە بەشی دووەمی کتێبی ( مسوڵمانی کاملّ ) دا بە تێرو تەسەلی باسی جۆرو چۆنیەتی خواپەرستیی مرۆڤی مسوڵمانمان کردوە خوێنەر حەوالّەی وی دەکەین و بەپێویستی نازانم ئەوەی لەوێ گوتومە دووبارەی

بکەمەوە، بەڵام لێرەدا چوار ئامۆژگاری گرنگ بۆ پێشمەرگەی ئیسلام دەخەمەڕوو.

١- بەس خودا مەبەست بوون ( الاخلاص )

یەکەمین ئاموژگاریم بۆ پێشمەرگـەی ئیسلام ئەوەیە کە لەپێش بەجێ هێنانـی هەر ئەرکێکی ئایین و ئەنجام دانی هەر فەرمانێکی خوادا دڵی خۆی بۆخوا یەکـلا بکاتەوەو بەس رازی کردنی خودای مەبەست بێ، چونکە ئەگەر وانەبێ دەبێتە سەپانی پووشێو لە ماندووبوونێ بەولاوە هیچـی دیکەی پێ نابرێ و، بگرە زۆریشی لەسەر قەرزدار دەبێتەوە، بەکورتی هەر کـارو ئیشێك ئیخلاصی لەگەڵ دا نەبێـت وەك گەنمی کوێروو لێدرا و بنەتووی خـۆی ناکاتەوە.

خوداش فەرموویەتی: ( فاعبدالله مخلصا له الدین..) الزمر / ٢.

واتە: خودا بپەرستەو بەندایەتی خۆتی بۆ یەکلا بکەوە..

جا لەبەر ئەوەی جارێکی دیکەش دێینەوە سەرووکاری ئەم باسە جارێ بەم ئەندازەیە وازدێنین.

٢ـ بەپێی سوننەت بەرێوەچوون

دووەمین ئامۆژگاریم ئەوەیە کە ئامان سەد ئامان بەموو لە ڕێ و شوێن و سوننەتی پێغەمبەری ڕابەر صلى الله عليه وسلم لانەدەی، چونکە خودا فەرموویەتی: ( لقد كان لكم فى رسول الله أسوه حسنه ) الاحزاب/ ٢١ . واتە: بێگومان لە پێغەمبەری خوادا سەرمەشقی‌یەکی چاك هەیە بۆ ئێوە .. دیسان خودا دڵنیای کردووین کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە هەڵەو تاوان پارێزراو ( معصوم ) ەو لەخۆیەوە نادوێ ( وما ينطق عن الهوى ) النجم/ ٣ . بەڵام سەبارەت بە هیچ کەسی دیکە ئەوجۆرە متمانە پێبوون و لێ دڵنیا بوونەی نەخستووینە بەردەست .

پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم لەو بارەوە فەرموویەتی: ( من أحدث فى أمرنا هذا ما ليس منه فهو ردّ .. ) رواه الشيخان وغيرهما . واتە: هەرکەسێك لەم ئایینەمان دا شتێك دابێنێ کە لەوی نەبێ ئەوە ڕەت کراوەیە ..

٣- وردو درشت لەلا گرنگ بوون

ئاموژگاری سێ یەمم ئەوەیە، کە نەچسی بەس بەو فەرمانانەوە پابەندبی کە فەرزو پێویستن و سوننەت و وردەبابەتەکان پشت گوێ بخەی، چونکە هەروەك چۆن جوانسیی و رێك و پێکی ئینسان چەندە لە سەرو .... گەردن و بەژن و بالاو دەست و لاق و شان و پیل و چاوو گوێ یانی دایە، هێندەش لە پرچ و نینۆك و برژانگ و برۆو لــــووت و پەنجەو لێوانی دایە، جوانیو رێكو پێکی ئیسلامیش چەندە لە ئەرك و فەرمانە فەرزو بنەرەتییەکانی دایە، هێندەش لەو سوننەتو وردە بابەتە جۆراوجۆرانە دایە کــــــە رێکخەرو تەواوکەری ئەرك و فەرمانـــــە سەرەکیو بنەرەتی یەکانن .

بەڵێ پێشمەرگەی ئیسلام لە هەموو شتێکی بەرنامەی خودای لەلا گرنگ و بایەخدارە چ ورد بێ چ درشت، چونکە درشت جێی خــۆی دەگرێ و وردیش جێی خۆی و شتاقیان ... کەلێنی ئەوی دیکە پرناکاتەوە .

٤- چێژوەرگرتن و شەیدا بوون

ئامۆژگاری چوارەم و کۆتاییم بۆ پێشمەرگەی ئیسلام ئەوەیە، کە هەوڵ بدات خواپەرستی و بەندایەتییەکەی لە رووی عیشق و خۆشەویستییەوە ئەنجام بدات و تام لە خواپەرستی و بەندایەتییەکەی بکات، چونکە گەورەترین میوەو بەرهەمی درەختی بڕوای تەواو ئەوەیە کە ئینسان تام و چێژ لە راز و نیاز و خزمەت و خواپەرستی وەرگرێ، جم و جووڵ و چالاکییە وەردەگرێ کە لە پێناوی خوادا ئەنجامی دەدات وە بە پێچەوانەوە تەنبەڵی و قالب گرانی و چێژوەرنەگرتن و ساردوسڕی نیشانەی دڵنەخۆشی و بڕوا دانەمەزرانە، وەك خودا دەربارەی دەغەڵە - کان فەرموویەتی: ( ان المنافقین یخادعون الله وهو خادعهم واذا قاموا الى الصلاة قاموا كسالى یراءون الناس ولا یذكرون الله الا قلیلا ) النساء/ ١٤٢ .

واتە: بێگومان دەغەڵەکان - بەخەیاڵی خۆیان - خوا هەڵدەخەڵەتێنن، بەڵام ئەم

## خاڵی چوارەم : خەسڵەتە پەسندەکانی پێشمەرگەی ئیسلام

وەك لە بەشی سێیەمی کتێبی ( مسوڵمانی کامڵ ) دا ڕوونمان کردوتەوە ، ڕەوشتی بەرزو سیفەتە پەسندەکان بەرهەمو میوەی درەختی خوا ناسین و خوا پەرستیین ، کەواتە پێشمەرگەی ئیسلام کە خاوەنی بڕوایەکی قووڵ و دامەزراوە ، بەئەندازەی قووڵی و دامەزراوی ی بڕوایەکەی ڕەوشت و خەسڵەتە پەسندەکانیشی تێدا دێنەدی •

جا ئێمە بۆ چاکتر ڕوونکردنەوەی مەبەست لەم خاڵەدا بەس باسی ئەو خەسڵەتە بەرزو پەسندانە دەکەین کە پەیوەندی بەڕاتی مرۆڤەوە هەیە وەك ( تاك ) یەك، وە لە خاڵێکی دیکەش دا باسی ئەو ڕەوشت و خووە بەرزو دڵگیرانە دەکەین کەسە وەك تاکێکی نێو کومەڵگا پەیوەندی یان بەمرۆڤەوە هەیەو مرۆڤی مسوڵمان بەشیوەیەکی ڕاست و ڕەوا بە کومەڵ و دەوروبەری یەوە دەبەستنەوە •

ئنجا بێگومان ئەو خەسڵەتە پەسندانەی کە لە ئەنجامی بڕوا و خواپەرستییەوە لە پێشمەرگەی ئیسلامدا دێنەدی یەکجار زۆرن، بەڵام ئێمە لێرەدا گوڵبژێرێکیان دەکەین و ئەوانەیان کە سەرەکی و بنەرەتیین، (1) دەیان خەینەڕوو:

١- گەڕانەوە لای خوا (التوبە)

مەبەستمان لە گەڕانەوە لای خوا بەس ئەوەندە نییە کە بە زار بگوترێ (استغفروا اللە واتوبوا الیە) چونکە ئەمە قسەو دەعوا - یەکە ڕاست و درۆیان هەڵدەگرێ و پەرێزو بەرەمیش بە لای یەکێکیاندا دەخات! بەڵکو مەبەستمان لە گەڕانەوە (توبە) ئەوەیە کە باباى مسوڵمان دایم و دەرەم چاودێرى خۆى بێت و نەیەڵێ شەیتان هەڵى خلیسکێنێ و، وە ئەگەر جاروبارێش شەیتان زەفەرى پێ بەرد یەکسەر واز لە تاوان و خراپەکەى بێنێ و لێى پەشیمان بێتەوە و بەکردەوە بگەڕێتەوە

---

(1) لە ڕاستیدا هەرکام لە (توبە) و (تقوی) وە (اخلاص) و (زهد) و (شجاعە) وە...هتد هەڵ - دەگرێ کتێبێکی سەربەخۆیان لەسەر بنووسرێ بەڵام ئێمە لێرەدا ئەو دەرفەتەمان نییەو با بۆ داهاتوو بێ •

سەر خەت و ڕێبازی خودا .

پێغەمبەریش صلی اللە علیە وسلم دەربارەی گەڕانەوە لای خوا فەرموویەتی: ( یا أیها الناس توبوا الی اللە واستغفروه فانی أتوب فی الیوم مأة مرە ) رواه مسلم . واتە: ئەی خەڵکینە بگەڕێنەوە لای خوا و داوای لێبوردنی لێ بکەن چونکە من ڕۆژی سەد جار دەگەڕێمەوە - لای خوا - .

ج- زانیاری ( العلم )

یەکی دیکە لە خەسڵەتە بەرزو پەسندەکانی پێشمەرگەی ئیسلام بریتییە لە زانیاری و شارەزایی چونکە بەبێ زانیاری و لێزانی و چاوساغی هیچ شتێك جێی خۆی ناگرێ و هیچ تیرێك نیشانە ناپێکی هەر بۆیەش خودا لە هیچ شتێك فەرمانی بە پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم نەکردوە کە داوای لێ بکات بۆی زیاد بکات جگە لە زانیاری ( وقل رب زدنی علما ) طه / ۱۱٤ .

بەڵێ پێشمەرگەی ئیسلام دەبێ زانا بێ بە بەرنامەکەی خۆی، زانا بێ بە ڕێچکەو مێچکان زانا بێ، دۆستان بناسێ، دەوروبەری بناسێ .. هتد .

٣ـ پارێزکاری ( التقوى )

( راغب الاصفهانی ) لە مانا لێدانەوەی وشەی تەقوادا فەرموویەتی: ( تەقوا لە زاراوی شەرعدا یانی خۆپاراستن لە هەر شتێك کە تاوانباری تێدایە ) .

بەڵێ سێیەمین خەسڵەتی پێشمەرگەی ... ئیسلام بریتییە لە خۆپاراستن لە تاوان، ( التقوى ) جا بێگومان هەروەك چۆن هەر کام لە نوێژ چواندن و ڕۆژوو خواردن و حەرام خواردن و دەست درێژی کردن و تاوان و خراپە دەبێ خۆیان لێ بپارێزێ، بەهەمان شێوەش هەرکام لە ڕوانینی حەرام و قسەی ناشیرین و راکردن لەبەر دوژمن و نهێنی نەپاراستن و بێفەرمانی کردنیش براگەورەش تاوان و خراپەن و باباى پارێز ـ کار دەبێ خۆیان لێ بپارێزێ، بەکورتی ( تەقوا ) یانی خوپاراستن لە هەرچی بێشەرعییە .

٤ـ بەس خودا مەبەست بوون ( الاخلاص )

وەك پێشتر گوتمان بەس خوا مەبەست بوون لە هەر ئیش و کارێك دا مەرجی

درووست بوون و وەرگیرانی ئەو کارەپیسە پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم فەرمووویەتی: (انما الاعمال بالنيات وانما لكل امرئ ما نوى..) متفق عليه. واتە: بێگومان - وەرگیران و وەرنەگیرانی هەموو کردەوەیەک - ی باش - بەس بەگوێرەی نیازو مەبەستە، وە بێگومان هەموو مرۆڤێک بەپێی نیازو مەبەستی حیسابی لەگەڵ دەکرێ.

شاعیرێکی فارسیش گوتوویەتی:

عبادت به اخلاص نيت نيكواست

وگرنه چه آيد زبی مغز پوست

اگر جز به حق ميرود جادهات

در آتش فشانند سجادهات

واتە:

خواپەرستی بە نیازو مەبەستی ساغەوە چاکە، دەنا تووێڵکی بێ کاکڵ چی لێ پەیدا دەبێ؟!

ئەگەر رێت بەکن غەیری خوادا بسوات بەرماڵەکەت لێ دەئاگری دا وپسێن!

بەڵێ ئیخلاس و خوا بۆ مەبەست بوون رووح و کاکڵی هەموو کردەووو چاکیەکەوو هەوێنی مەیینی هەموو شێکە، بەبێ وی هەموو گەنج و رەنجت بایی پوولێکە!!

كەواتە : هەروەك چۆن هیچ وەستایەك دەست بە دیوارداناننا كات هەتا بناغە دانەرێ - ژێ ، تۆش ـ ئەی پێشمەرگەی ئیسلام ـ دەست مەدە هیچ كارێك هەتا بناغەی ئیخلاصی بۆ دانەرێژی و تەواو دلنیا و مسۆگەر نەبی كە جگە لە رەزامەندی خودا هیچ نیازو مەبەستێكی دیكەت لە دل دا نیە ، دەنا نەك هەر هیچت پێ نابڕی زۆریش قەرزدار دەبیەوەو دووچاری سزا و تولەش دەبی .

ـ پشت بەخوا بەستن ( التوكل )

یەكی دیكە لە خەسلەتە بنچینەییەكانی پێشمەرگەی ئیسلام بریتییە لە پشت بە خوا بەستن و پال وەخوادان هەلبەتە پشت بەخوا بەستن لە زۆر جێی قورئان و .... سوننەت دا مەدحی كراوە بۆ وێنە خودا فەرموویەتی :( ومن یتوكل علی اللە فهو حسبە ..) الطلاق / ٣ . واتە : وە هەركەسێك پشت بەخوا ببەستێ ئەوە ئەوی بەسە .

پێغەمبەریش صلی اللە علیە وسلم فەرموو ـ یەتی :( من أحب أن یكون أقوی الناس

فلیتوكل علی الله ) رواه ابن ابی حاتم .
واته : كێ پێی خۆشه لەهەموو كەس بەهێزتر
بێ با پشت بە خودا ببەستێ .
هەڵبەته مەبەست لە پشت بە خوا بەستنیش
فرێ دان و پشت گوێ خستنی هۆیەكـانی
( الاسباب ) نیه وەك هەندێك كەس بە هەڵە
وا حاڵی بوون (١) .

٦ـ دنیا بەكەمگرتن ( الزهد )

خۆشویستنی ژیانی دنیاو هەڵبژاردنی
بەسەر دوا رۆژدا یەكێكه لەو خەسڵەتـانە
بەدنانەی كە لە كافرو خوانەناسان دا دێنە
دی ، خوای بێ هاوتا فەرموویەتی : ( ....
و ویل للكافرین من عذاب شدید الـذین
یستحبون الحیاه الدنیا علی الآخره.....)
ابراهیم/ ٢ـ ٣ . واته : وە هاوار بۆ
كافران لە ئازارێكی توند ، ئەوانەی كە
ژیانی دنیا بەسەر دوا رۆژدا هەڵدەبژێرن .

---

(١) سەرنجی بەشی یەكەمی كتێبی
( مسولمانی كامڵ ) بدە .

بەلام پێشمەرگەی ئیسلام ئەگەر هەر ژیانی دنیا ناکاتە ئامانج و مەبەستی هەرە ... بەرزی و بەسەر ژیانی دواڕۆژدا هەڵی نابژێرێ بەڵکو زۆریشی بەکەم دەگرێ چونکە خودا فەرموویەتی : ( ... فما متاع الحیاة الدنیا فی الآخرة الا قلیل ...... ) التوبة / ٣٨ . وە رابواردنی ژیانی دنیا لەچاو دواڕۆژ بەس شتێکی کەمە ... وە چونکە رابەرەکەی فەرموویەتی : ( ما مثل الدنیا فی الآخرة الا مثل ما یجعل أحدکم أصبعه فی الیمّ فلینظر بم یرجع ! ) رواه مسلم وابن ماجه . واتە : نیە وێنەی دنیا بە لەچاو دواڕۆژ تەنیا وەك ئەوە نەبێ کە یەکێکتان قامکی دەخاتە نێو دەریاوە ، جا با سەرنج بدات داخوا چ بە پەنجەیەوە دێ !! ( واتە ژیانی دنیا لەچاو دواڕۆژ وەك ئەو تۆزە ئاوە وایە کە بە قامکیەوە هاتەوە لەچاو ئاوی دەریا ! ) .

دنیا بەکەمگرتنی پێشمەرگەی ئیسلامیش

لەزۆر شتان دا دەردەکەوێ بۆ وێنە :
بەرگی سادەو هەرزان پۆشین و ، بەتەنگ
خواردن و خواردنەوە وە نەبوون و ، بەرچاو
تێری و مال و پارە کۆنەکردنەوەو گوێ
نەدانە مەدح و زەمی خەڵکی و .. هتد .
٧ـ خۆراگری ی ( الصبر )
یەکی دیکە لە خەسڵەتە پەسندەکانی
پێشەوەرگەی ئیسلام بریتییە لە خۆراگری ی ،
خۆراگری ی ( صبر ) یش وەك ( راغب
الاصفهانی ) دەڵێ : ( حبس النفس عمّا
تکره ) بریتییە لە حەپس کردنی نەفس
لەسەر شتێك کە پێی ناخۆشە .
( عبدالقادر ) ی گەیلانییش خوا لێی
خۆش بێ فەرموویەتی : ( خۆراگری سێ بەشە )
أ ـ خۆراگری لەسەر فەرمانبەری ( الصبر
علی الطاعه ) ب ـ خۆراگری لەسەر تاوان
نەکردن ( الصبر علی المعصیه ) ج ـ وە
خۆراگری ی لەسەر بەلاو گیروگرفت .
وە دەتوانین بەشێوەیەکی دیکەش
خۆراگری ی دابەش بکەین و بڵێین :

خۆراگری ی سێ بەشە :

أ - خۆراگری لەئاقار داخوازی یە خراپەکانی نەفس دا .

ب - خۆراگری لەئاقار دنەدان و خوتەی شەیتان دا .

جـ - خۆراگری ی لەئاقار دوژمنان دا کە (رباط) ی پێ دەگوترێ .

ئەم ئایەتەش هەرسێکیانی کۆکردوونەوە :

(یا أیها الذین آمنوا اصبروا وصابروا ورابطوا واتقوا الله لعلکم تفلحون) آل عمران / ۲۰۰ . واتە :

ئەی بڕوادارینە خوراگر بن و - لەئاقار شەیتان دا - خۆتان ڕاگرن و - لەئاقار دوژمنان دا - سەنگەر بگرن وە پاریزی لەخوا بکەن بەشکم سەرفراز بن .

۸- هەست کردن بە چاودێری خودا

یەکی دیکە لەو خەسڵەتە بەرزانەی کە پێشمەرگەی ئیسلامیان پێوە دەناسرێ بریتیە لەوەی کە دایم و دەرەم هەست بە چاودێری (مراقبە) و بەسەر ڕاگەیشتنی خودا

دەکات و دەزانێ کە خودا مێروولەی ڕەش لە شەوی تاریک دا بەسەر بەردی ڕەشـــەوە دەبینێو دەنگ و چرپەی مارو مێروو دەبیســـ ـتێو ، هەست بە سیلەی چاو خــورپەی دڵ دەکات و هیچی لێ ون نابێ وەك فەرموویەتی ( وما یخفی علی اللە من شیء فی الارض ولا فی السماء ...) ابراهیم/ ٣٨ . واتە : وە هیچ شتێك لەخوا ون نابێ نە لە زەویو نە لە ئاسمانیدا ، پێغەمبەریش صلی اللـــە علیە وسلم فەرموویەتی :( اتق اللە حیثما کنت ...) رواە الترمذی . واتە : لە هەر جێیەکی بووی لەخوا بترسە .

خاڵی پێنجەم : ڕەوشتی پێشمەرگــەی ئیسلام لەگەڵ خەڵکیدا

ئەو خوو و ڕەوشتە بەرزانەی کـــە پێشمەرگەی ئیسلامیان پێوە دەناسرێن زۆرو جورا و جۆرن بەلام لێرەدا مەودای باسکردنی هەموانیان مان نیەو بەس گولبژێرێکیــان دەکەین :

١- ســوود بەخەڵك گەیاندن

گەورەترین و بنەڕەتی ترین ڕەوشتـی

پێشمەرگەی ئیسلام بریتییە لەوەی کە
ئەوەندەی بۆی بلوێ سوود بە خەڵکی دەگەیەنێ
بەدڵ، بەزمان، بەدەست، بەماڵ .. چونکە
پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم فەرموویەتی
( خیر الناس أنفعهم للناس ) رواه القضا
- عی . چاکترینی خەڵکی ئەو کەسەیە کە
سوودبەخشترە بۆ خەڵکی .

٢- ڕێز لەخەڵکی گرتن

پێشمەرگەی ئیسلام لەسونگەی ئەوەوە کە
بۆخۆی خاوەنی ڕێزو حورمەتە، ڕێزو حورمەتی
هەموو کەسێکی لەکنەو، قەت شتێکی وا پێشا
نادات کە کەسایەتی هیچ کەسێکی پێ بڕووشێ
وە هەوڵ دەدات کە بە پەسندترین و خۆشترین
ناوو بانگی هەرکەسێک بکات، چونکە پێغە
- مبەرەکەی صلی اللە علیە وسلم وای
پێ فەرمووە .

٣- خۆلەئیشی کەسەوە هەڵنەقورتاندن

پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم فەرموو
- یەتی :( من حسن اسلام المرء ترکە ما لا
یعنیه ) رواه أحمد والترمذی وغیرهما .
واتە : لە تەواوی و جوانیی موسڵمانەتی

مرۆڤ ئەوەیە کە هەرشتێك پەیوەندی بە
وی یەوە نەبێ خۆی تێ هەڵنەقورتێنێ .
جا خۆ لە ئیشی خەڵکی یەوە هەڵنەقور
- تاندن و لە هەموو دیزان نەبوونـــه
ئەسکۆی ، یەکی دیکەیە لە ڕەوشتە بەرزەکا
- نی پێشمەرگەی ئیسلام .
٤- زیان و قازانجی خەڵکی وەك ئی خــۆ
حسێب کــردن :
یەکی دیکە لە ڕەوشت و خووە پەسەندو
هەڵبژاردەکانی پێشمەرگەی ئیسلام ئەوەیە
کە خۆشی و ناخۆشی و قازانج و زیانــی
مسوڵمانان وەك ئی خۆی لەقەڵەم دەدات ،
چونکە پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم
پێی فەرمووە ( لایؤمن أحدکم حتی یحب
لاخیه ما یحب لنفسه ) متفق علیه . واته :
یەکێك لەئێوە بڕوا نایەنێ هەتا چونی
بۆخۆی پێ خۆشە ئاواشی بۆ براکەی پێ خۆش
نەبێ .
٥ - خەڵك بەسەرخۆدا هەڵبژاردن
یەکی دیکە لەو ڕەوشتە بەرزو پەسندا
- نەی کە دەبێ پێشمەرگەی ئیسلام هەوڵی

خۆیی را زاندنەوەی بدات بریتییە لە
بەسەرخودا هەڵبژاردنی خەڵك ( الایثار )،
هەڵبەتە تاق و لۆق نەبێ ناگەنە لووتکەی
بەرزی ئەم رەوشتە مەزنە ئیسلامییەی کە
خودا کردوویەتی بە مەدحی بەرادەرە
هەڵبژاردەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه
وسلم،وەك دەفەرموێ :( .. ویؤثرون علی
أنفسهم ولو کان بهم خصاصه .. ) الحشر
/ ٩ . واتە : وە خەڵکی بەسەر خۆیان دا
هەڵدەبژێرن هەرچەندە بۆخۆشیان پێویستی
- یان هەبێ .

٦- نەرم و نیانی و خۆ بەکەم گرتن

خوای مەزن لە وەسفی برادەرانی
پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم
فەرموویەتی :( .. رحماء بینهم .. ) الفتح
/ ٢٩ . واتە :

.. لە نێو خۆیان دا بەبەزەیین ..

هەروەها لە جێیەکی دیکەدا لە وەسفی
ئەو مسوڵمانە هەڵبژاردانەدا کە بەرنا
- مەی خۆیانیان پێ دەبووژێنێتەوە،
فەرموویەتی :( .. اذلة علی المؤمنین .. )
المائدة/ ٥٤ . واتە :

.. لەئاقار بڕواداران دا گەردن کەچن.

بەڵێ یەکی دیکە لە خوو و ڕەوشتەکانی پێشمەرگەی ئیسلام لەگەڵ خەڵکی مسوڵمان دا بریتییە لە نەرمونیانیو، سینگ فراوانیو، خۆ بەکەمزانی، هەڵبەتە مرۆڤیش بە خۆبەکەمگرتن لەبەرانبەری بڕواداران دا گچکە نابێتەوەو لێی دانالەنگێ بەڵکو بەپێچەوانەوە پێی بەرزدەبێتەوە وەك ...

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی (من تواضع لله رفعه الله) رواه أحمد وابن ماجه . واتە :

هەرکەسێك لەبەر خوا خۆی بەکەم بگرێ خوا بەرزی دەکاتەوە .

٧- پاراستنی ئەندامەکان

یەکی دی لەو ڕەوشتە پەسندانەی کە پێشمەرگەی ئیسلام لە بواری پەیوەندی لەگەڵ خەڵکیدا ڕەچاویان دەکات بریتییە لەوەی، کە هەموو ئەندامە پەنهان و رواڵەتییەکانی دەپارێزێ لەوەی کە بە شێوەیەك بەکاریان بێنێ زیانی مسوڵمانێکی تێدابێ .

بەڵێ پێشمەرگەی ئیسلام ئەندامەکانی

ناکاتە درندەو سەگی هار لە بەڵەکەی

خەڵکیان بەرنادات، بەڵکو بە جڵەوی

عەقڵ و شەرع رێشمەیان دەکات و لەوا شەیان

دەکات و ناهێڵێ خەتێ خوارپکەن، زمانی

لە درۆو غەیبەت و بوختان و توانج و

پلارو ناوو ناتۆرەو جنێوو خۆ بەسەر

خەڵکیدا هەڵکێشان و دووزمانی و چاسووسی و

.. هتد دەپارێزێ.

وە گوێی لە بیستنی هەموو قسەیەکی

خراپ و بێشەرعی دەپارێزێ بەتایبەتی

کە زیانی مسوڵمانێکی تێدا بێ، مەگەر لە

چەند حاڵەتێکی هەڵاوێرراودا کە بەرژە

- وەندی مسوڵمانانی تێدا بێ.

وە چاوی لە هەموو روانینێکی خراپ و

بێشەرعی دەپارێزێ، و لە شتی حەلاڵ و

شەرعیدا نەبێ بەکاری نایەنێ.

وە دڵی لە هەموو جۆرە گومان و خەیا

- ڵێکی پەدو پیس دەپارێزێ سەبارەت بە

هەرکام لە مسوڵمانان، هەرچەندە لەجێی

خۆشیدا کە پێویست بکات ڕێ بەخۆی دەدات گومان بەکاربێنێ ، چونکە زۆرجاران گومان ڕێی گەیشتنە هەق و ڕاستییە ، پێغەمبەریش صلى الله علیه وسلم فەرموویەتی :
( الحزم سوء الظن ) أخرجه الدیلمی .
واتە : گومانی بەدبردن - لە جێی خۆی دا - مایەی دووربینییە .
هەروەها دەبێت و لاقی لە هەموو کرداروڕەفتارێکی خراپ دەپارێزێ و گەدەی لە هەموو پارووێکی حەرام دەپارێزێ و هتد..
٨- بەڵام هەڵوێست و ڕەفتاری پێشمەرگەی ئیسلام لەگەڵ نا موسڵمانان دا لەمەی ڕابورد جوێ یەو بەکورتی دوو جۆرە :
أ- ئەگەر لە حاڵەتی بانگەوازی کردن و حاڵی کردن و تێگەیاندنیان دا بێ ، ئەوە ئەوپەڕی نەرمی و هێمنی و لێزانی و پشوو درێژی بەکاردێنێ ، چونکە خودا فەرموویەتی
( ادع الى سبیل ربك بالحکمە والموعظە الحسنە ... ) النحل / ١٢٥ . واتە :
بانگەواز بکە بۆ لای ڕێی پەروەردگارت بە وەستایی و بە ئامۆژگاری چاك ...

دیسانێ خودا که مووسا و هارووننی برای ناردە لای فیرعەون بۆ تێگەیاندن و.. بانگ کردنی پێی فەرموون:
( فقولا له قولا لینا..) طه/ ٤٤ . واته:
قسەیەکی نەرمی لەگەڵ بکەن ..
ب ـ بەڵام ئەگەر لەحاڵەتی رووبەرووبوونەوە جەنگ و بەرەنگاری دا بێ ئەوە خودا فەرموویەتی:( أشداء علی الکفار .... ) الفتح / ٢٦ . واته: لەسەر کافران توندو تیژن .
دیسان بە پێغەمبەری فەرمووە:( یا أیها النبی جاهد الکفار والمنافقین واغلظ علیهم ..) التوبه/ ٧٣ . واته:
ئەی پێغەمبەر لەگەڵ کافرو دەغەڵەکان دا بجەنگەو رەقییان بەرانبەر بنوێنە .
هەروەها خوای زانا پێمان دەفەرموێ:
( یا أیها الذین آمنوا قاتلوا الذین یلونکم من الکفار ولیجدوا فیکم غلظه واعلموا ان الله مع المتقین ) التوبه / ١٢٣ . واته: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە لەگەڵ ئەو کافرانەدا بجەنگن

کە لێتانەوە نیزیکن وە با رەقیتان پێوە شک بەرن، وە بزانن کە خوا لەگەڵ پارێز - کاران دایە .

بەڵێ لە حاڵەتی بەرەنگاربوونەوەدا پێویستە پێشمەرگەی ئیسلام لەگەڵ دوژمنانیدا هەتا پێی دەکرێ دڵ رەق و بێ بەزەیی بێ و شێری چەنگ بەخوێن بێ و، زەبری وایان لێبدات کە، ئەگەر لە ئی پێشەوەیان بدرێ ئەوەی لەدواوەیانەوەیە پێی تەمبێ خواردوو بێ و زراوی بچێ ، وەک دەفەرموێ :

( فشرد بهم من خلفهم لعلهم یذکرون )

الانفال / ٥٧ . واتە : جا زەبرێکی وایان لێ بدە کە ئەوانەی لەدوایانەوەن پێی پرژوبڵاوبن بەشکم پەند وەربگرن !!

خاڵی شەشەم : ئەو خەسڵەت و رەوشتە بەدانەی کە خۆیان لێ دەپارێزی

ئەو خەسڵەت و خوو و رەوشتە نەنزم و پیسانەی کە پێشمەرگەی ئیسلام خۆیان لێی دەپارێزی زۆر زۆرن، بەڵام لەبەر کەم دەرفە - تی لێرەدا بەس هەندێکیان لێ بە نموونە

دێنینەوە :

١- شەرم لەخوا نەکردن

پۆشەرمیی سەبارەت بە خودا پیسترین خەسڵەتە ، چونکە لەخوا ترسان سەری هەموو زانیاریی یەکە ( رأس الحکمه مخافه الله . ) رواه البیهقی . مادام وابێ بەپێچەوا - نەوە لەخوا نەترسان و شەرم لەخوا نەکردن ئەسڵ و بنچینەی هەموو جۆرە تاوان و سەرپ - ێچییەکە ، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەوبارەوە فەرموویەتی : ( آخر ما أدرك الناس من کلام النبوە الاولی : اذا لم تستح فاصنع ما شئت ) رواه أحمد وابن ماجه

واتە : دوابین قسە کە خەڵك لە قسەی پێغەمبەرانی پێشووەوە پێیان گەیشتووە - ئەمەیە- ئەگەر شەرمت نەکرد چ دەکەی بکە !!

بەڵێ پێشمەرگەی ئیسلام خۆی لەم خەسڵەتە بەستە دەپارێزێ ، چونکە بڕوای بەخوا هەیەو دەیناسێو هەرکەسێکیش خوا بناسێ بــــه ئەندازەی ناسینی شەرمو شکۆو ڕێزو سامو هەیبەتی لەدڵ دا پەیدا دەبێ سەبارەت بەخوا

پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم فەرمووبەتی : ( استحیوا من الله عزوجل حق الحیاء .. ) رواه أحمد - واتە : وەك لە خودای زاڵ و پایەبەرز دەوەشێتەوە شەرمی لێ بکەن ..

٣- بەدگومانی بەرانبەر بەخوا

یەکی دی لەو خەسڵەتە نزم و پیسانەی کە پێشمەرگەی ئیسلام لەخۆیان نا وەشێنێتەوە بریتییە لە بەدگومانی ( سوء الظن ) دەربارەی خودا .

هەڵبەتە ئەم خەسڵەتە نزمەش وەك ئەوەی پێشوو وەك هەر خەسڵەتێکی دیکەی نزم و خراپ لە سروشتی زەلکاوی بڕوا کزی و نڵێنەخۆیی - یەوە پەیدا دەبێ .

وە بەدگومانی دەربارەی خوا لــــــــە زۆر بواران دا خۆی دەنوێنێ :

ترسان لە مردنی جۆرێکە لە بەدگومانیی بەرانبەر بەخودا :

وە ترسان لە دوژمن و چەك و تەقەمەنیی و هەڕەشەو گوڕەشەی لە بەدگومانی سەبارەت بەخواوە هەڵدەقوڵێ ، دەنا مادام بڕوات وایە

خوا پشتیوانته دەبێ بشزانی کە دەستەلا
- تی خوا لەئی دوژمن زیاتره !!
وه ترسان له هەژاری و بێ بژیوی جۆرێکه
له بەدگومانی بەرانبەر بەخوا ؛ چونکه
خودا بەلێنی داوه کە دەت ژیەنێ ( وما من
دابه فی الارض الا علی الله رزقها ) هود/٦
واته : وه هەر زیندەوەرێك کە لەزەویدایە
ڕۆزی لەسەر خودایە .
وه ترسان له سپلەییو پێ نەزانیو ناسوپا
سی خەلکی جۆریکه له بەدگومانی دەربارەی
خوا، چونکه تۆ کە ئیشت بۆخوا کردووه
خەلك پێبزانێ یان نەزانێ خوا ئاگادارەو
تۆماری کردوه ؛ مادام وابێ خەمو مەراقی
بۆچی یه ؟!
وه ریابازی جۆریکه له بەدگومانی سەبارەت
بەخوا ؛ چونکه ریابازی بۆیه سەرنجی
خەلکی بۆلای کردەوەکانی خۆی رادەکێشێ ؛
چونکه هەست بە چاودێری خوا ناکات و پێی
وانیه کە خوا پاداشتی دەداتەوە هەلبەته
ئەمش بەدترین گومانه بەرانبەر بەخوا .

٣- کات بەفیڕۆدان بە قسەو کردەوەی پووچ
دەستمایەی دەستی هەر ئینسانێك ئەو کومەڵە سەعات و ڕۆژو مانگ و ساڵەیە کە تەمەنی پیاك دینن، جا بێگومان خەرجکردنی ئەو دەستمایەو بەرێ کردنی ئەو تەمەنە گرانمایە بە قسەو کردەوەی بێسوودو پڕو پووچ کە لە زاراوی ئیسلامدا (لغو) ی بۆ دانراوە، خەسڵەت و ڕەوشتێکی زێدە نزم و پیسەو ئینسان بەرەو کەندەلان و هەڵدێری مایەپووچی، خاوەن هیچی، دەبات، بۆیە پێشمەرگەی ئیسلام هێندەی درندەیەك خۆی لەم خەسڵەت و ڕەوشتە بەدە دەپارێزێ و هەوڵ دەدات بە هیچ جۆرێك کەلێن وبۆشایی - یەك نەکەوێتە تاوەکانی تەمەنییەوە، هەڵبەتە ئیسلامیش بەرنامەو پەیرەوێکی هێندە ڕێك و پێکی بۆ مرۆڤی مسوڵمان دانا وە کە قەت بێکارو دەست بەتاڵ نابێ، بۆ وێنە هەرکام لە نوێژکردن قورئان خوێندن و لەبەرکردن، موتالا، بیرکردنەوە، ذیکرکردن، یادی مردن کردن، سەرکۆنەی

خۆکوردن ( محاسبة النفس ) ، تۆبەکـــردن،
سەرداشی دۆستان، گەڕان و سەرنـــج دان
لە موڵکی خودا، قسەی خۆش کردن لەگەڵ
ماڵ و منداڵ و ئاموژگاری کردنیــان و
پەروەردەکردنیان، پەیدا کردنی بژیوی ...
حەلاڵ، نەخشەکێشان بۆ لەنێوبردنی دوژمنان،
غەزا کردن، ئێشکەگرتن، سەنگەرگرتـــن
خەڵوەکێشان ( اعتكاف ) و .. هتد ئیســلام
کردوونی بە ئەرکی سەرشانی بابــای
موسڵمان بۆ ئەوەی قەت بێ کار نەبێ و
سەوداى نەبێ دەستەوئەژنۆ دانیشێ !!
٣- چڵێسی و ئەوسنی
یەکێ دی لەو خەسڵەت و ڕەوشتە دزێوو
ناشوولایانەی کە پێشەمەرگەی ئیسلام لەخۆیان
ناوەشێنێتەوە و خۆیان لێ دەپارێزن بریتیە
لە چڵێسی و بەدوای داخوازی یەکانی نەفسدا
گەڕان و سووڕان، بەجۆرێك کە لە ڕێـــزو
حورمەتی دانەلەنگێنێ و لەنێو خەڵکـــیدا
سووکی بکات و بیشکێنێ، جا بێگومان چڵێسی
لە بابای موسڵمان ناوەشێتەوە چونکــــە

مسوڵمان بەندەی خودا بەو کۆیلەی گەدەو گیپاڵی نیەو بۆیە دەخوات تا بژی نەك بۆیە بژی تا بخوات !!

هەڵبەتە جڵەوتوندکردنی نەفسیش بنەرەتی ترین هۆی بەمرادگەیشتن و سەرفرازی یەو،بە بەراوەژووەوە جڵەوشل کردنی نەفس بنك و ریشەی هەموو بەدبەختی‌و ماڵ ویرانیەکە،چوای‌ پێ ڕیشەلەوبارەوە فەرموویەتی: ( وأما من خاف مقام ربه ونهى النفس عن الهوى فإن الجنة هي المأوى) النازعات / ٤٠-٤١

واتە : بەڵام ئەوەی لە پلەوپایەی پەروەردگاری بترسێ‌و نەفسی لە ئارەزووەکان بگێڕێتەوە ئەوە بەهەشت جێگەیەتی.

٥ - ڕژدی‌و چرووکی

ڕژدی‌و دەست قووچاندن و چرووکی یەکێکە لە خەسڵەتە هەرە بەدو ناشیرینەکان و بابای چرووك بەدگومانە ....
سەبارەت بەخودا و،پێی وایە عەمبارەکانی خوا بەتاڵ بوون و هەر ئەوەندەیە...

تێدا مابوو کە هاتۆتە گیرفانی وی یەوە،
جا پێشمەرگەی ئیسلام زۆر خۆی لەم خەسڵە
ـ تە پیسە دەپارێزێ چونکە دەزانێ
کە خەسڵەتی گۆڕین بە فەرمانی شەیتان
لەمڕۆش دا دێتەدی ، وەك خودا فەرموویەتی
( الشیطان یعدکم الفقر ویأمرکم
بالفحشاء .. ) البقرە / ٢٦٨ . واتە :
شەیتان بەڵێنی هەژاری یتان دەداتێ و
فەرمانتان پێ دەکات بە ڕژدی ..
هەڵبەتە بابای ڕژدو چرووکیش سەرباری
ئەوەی کە لە دنیادا سووك و بێ نرخ و
بوغزێنراوە لەلایەن خەڵکییەوە لە
دوارۆژیش دا بێرەزاترین سزا و ئازار
چاوەڕێ یەتی وەك خودا فەرموویەتی :
( ولا یحسبن الذین یبخلون بما آتاهم
الله من فضله هو خیرا لهم بل هو شر
لهم سیطوقون ما بخلوا به یوم القیامه )
آل عمران / xxx ١٨٠ . واتە :
وە با ئەوانەی کە لەوەدا خوا لە بەخششی
خۆی پێی داون ڕژدی دەنوێنن وانەزانن

ئەو کارە شتێکی چاکە بووان، بەڵکو بویان خراپەو لەمەودوا ئەوەی کە ڕژدی یان تێدا دەکرد، دەکرێتە مارێکی کەچەڵ و لە ئەستۆیان دەئاڵێنرێ.

٦ـ بەدگومانی (سوء الظن)

بەدگومانی سەبارەت بە خەڵکی مسوڵمان کێم و زوخاوێکە لە دڵێکی نەساغ و پیسەوە پەیدا دەبی، چونکە ئینسان بەزۆری لە هەمبانەی خۆی دا گوێزان دەژمێرێ و هەر کەسێک بەرانبەر بە خەڵکی بەدگومانی کردە یاساو بنچینە، دیارە بۆخۆی پیسەو نەگریس و بێ خێرەو (قیاس النفس) ی کردوە!

هەر بۆیەش پێشمەرگەی ئیسلام زۆر خۆی لەم سیفەتە پیسە دەپارێزێ و لەخۆی ناوەشێنێتەوە، چونکە پێشمەرگەی ئیسلام لەبەرئەوەی خۆی لەخۆی دا پاکی و چاکی ی کردوتە پیشەو پێشی خۆشە خەڵک بە پاکی و چاکی تەماشا بکەن و گومانی چاکی پێ بەرن، دیارە بۆ خەڵکیش هەر بەهەمان ڕێبازە دەپێوێ!

خوداش دەربارەی پەدگومانی فەرموویەتی
(یا أیها الذین آمنوا اجتنبوا کثیرا من الظن ان بعض الظن اثم ..) الحجرات/ ١٢ . واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە لە زۆر گومانان دووره‌پەرێزبن، بێگومان هەندێك گومان تاوانن ..
وەك دەبینین لەبەرئەوەی هەندێك گومان تاوانن و جێی خۆیان ناگرن، خوا فەرمانمان پێ دەكات كە لە زۆربەی گومانان خۆ بپارێزین، بەلام جێی سەرنج ئەوەیە كە خودا نەیفەرموە لە هەموو جۆرە گومانێك دووره‌پەرێزبن، چونكە گومانی وا هەیە زۆر بەجێیەو نەك هەر تاوان و خراپ نیيە بگرە خێرو چاكەشەو نیشانەی عەقڵ و ووریبینیيە .
كەواتە: بەكورتی پێشەرگەی ئیسلام بەد گومانی ناكاتە پایاو بنچینەی تێڕوانینی بەرامبەر بەخەڵكی، بەلام لەجێی خۆشیدا گومانی بەد بەكاردێنێ و دەیكاتە هۆی پەیڕەوی لێكۆڵینەوەو گەیشتنە ئەنجام .

٧- بەدوای عەیبی خەڵکیدا گەڕان

هەڵبەتە بەدگومانی دەبێتە هۆی پەیدا
- بوونی گەلێك جۆرە نەخۆشیو خەسڵەتیمی
خراپ کە یەکێکیان بریتییە لە ( بەدوای
عەیبی خەڵکیدا گەڕان ) ، ئەم خەسڵەتەش
شتێکی بەدو ناڕەوایە ، چونکە بەنسدە
پێغەمبەر نابێو مسوڵمانیش لەجیاتی گەڕانو
سووڕان بەدوای دۆزینەوەی عەیبو ناتەبە
- واوی یەکانی خەڵکیدا پێویستە بەدوای
ئیخۆی دا بگەڕێ ، وەك پێغەمبەر صلی اللە
علیە وسلم فەرموویەتی : ( طوبی لمن شغلە
عیبە عن عیوب الناس ) رواە الدیلمی
والبزار . واتە : خۆشیی بۆو کەسەی
کە هەڵەو ناتەواوی خۆی وای لێ دەکات
ئاگای لە هەڵەو ناتەواوی یەکانی خەڵکی
نەمێنێ .

ئیسلام یەکێك لە ڕەوشتە بەرزەکانی
بابای مسوڵمان بریتییە لە عەیب پۆشینی
خەڵکیوەگەڕان و پشکنین بەدوای دیتنەوەی
هەڵەوپەلەی خەڵکیدا سیفەتی مسوڵمان
نیەو توندترین سزای بۆ دانراوە ، وەك

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی ( من ستر عورة أخیه المسلم ستر الله عورته یوم القیامه ومن کشف عورة أخیه المسلم کشف الله عورته ففضحه فی بیته ) رواه ابن ماجه . واته : هەرکەسێک عەیبی برای مسوڵمانی بپۆشێ خودا لە ڕۆژی دوایدا عەیبی دەپۆشێ ، وە هەر کەسێک عەیبی برای مسوڵمانی وەدەربخات خوا عەیبی وەدەردەخات و لەماڵی خۆی دا ڕیسوا و شەرمەزاری دەکات !!

٨- تەنگەپریسکەیی و زوو تووڕەبوون

یەکی دی لەو ڕەوشت و خووە بەدانەی کە پێشمەرگەی ئیسلام خۆیان لێ دەپارێزێ بریتییە لە تەنگەپریسکەیی و بێ حەوسەلەیی و زوو تووڕەبوون ، چونکە وەک خواناسانی دڵ و بێدار فەرموویانە ( تووڕەیی ڕەشەبایەکە چرای عەقڵ دەکوژێنێتەوە ) جا لەڕاستیدا ئینسان بەهۆی عەقڵەوە ڕاست و چەوت و چاک و خراپ لێک جوێ دەکاتەوە ، هەر کاتێک حوکمی عەقڵ بەسەر مرۆڤدا نەما لە ئینسان دەشۆرێ و دەچێتە ڕیزی ماڵات !

هەربۆیەش خوای مێمن و بەئارام لە وەسفی پارێزکارو چاکەکاران ( المتقین والمحسنین ) دا فەرموویەتی :

( والکاظمین الغیظ والعافین عن الناس ) آل عمران / ۱۳٤ ، واتە : وە ئەوانەی تووڕەیی قووت دەدەنەوەو لە خەڵکی دەبوورن !

پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم فەرموو یەتی : ( لیس الشدید بالصرعة انما الشدید الذی یملك نفسه عند الغضب ) متفق علیه ، واتە :

پاڵەوان ئەوە نییە کە خەڵکی زۆر لەعەرزی دەدات بەڵکو پاڵەوان ئەو کەسەیە کە لە دەمی تووڕەییدا بەسەر خۆیدا زاڵ دەبێ .

۹ ـ خۆبەزلگرتن و خەڵك بەکەمگرتن

ئەمەش یەکی دیکەیە لەو خوو و خدە دزێوو ناشیرینانەی کە لە پێشمەرگەی ئیسلام ناوەشێنەوەو خوێیان لێ دوور دەگرێ، چونکە لەڕاستیدا گەورەیی و خوبەگەورەگرتن بەس لایقی خودایەو جگە لەوی هەموومان بەندەین و کەس ئیمتیازو پلەی بەسەر کەسدا

بیەو لە بەندایەتیو سروشت و رەگەزدا وەك دەنکەکانی شانە یەکسانین ( الناس مستوون کأسنان المشط ) أخرجه الدیلمی ج

لیسان خۆبەگەورەگرتن و خەڵك بەکەمگرتن بوو کە وای لە شەیتان کرد ببێتە شەیتان و لە فەرمانی خوا دەرچێو ماڵی خۆی کاول بکات، وەك خودا فەرموویەتی : ( واذ قلنا للملائکه اسجدوا لآدم فسجدوا الا ابلیس أبی واستکبر وکان من الکافرین ) البقره / ٣٤ .

لەم ئایەتەدا خۆبەزلگرتنی شەیتان خراوەتەروو وە لە ئایەتێکی دیکەدا کە دەفەرموێ : ( أأسجد لمن خلقت طینا ) الاسراء / ٦١ . خەڵك بەکەمگرتن و بە چاوی سووك سەیرکرانی ئادەم لەلایەن شەیتانەوە خراوەتەروو !

بەڵام نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێ کە هەندێك شت هەیە دەچێتە خانەی عیززەت و نەفس بەرزی ی یەوەو بە خوبەزلگری ( الکبر ) لەقەڵەم نادرێ، چونکە رۆژێکی

پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم فەرمووی ( لایدخل الجنە من کان فی قلبە مثقال ذرە من کبر ) هەرکەسێك هێندەی گرانی گەردیلەیەك خۆبەزلگری لەدڵدا بێ ناچێتە بەهەشتێ ، کابرایەك گوتی : ئەی پێغەمبەری خوا مرۆڤ حەزدەکات پێلاوەکەی چاك بێ و بەرگەکەی چاك بێ ! ئەویش فەرمووی : ( ان اللە جمیل یحب الجمال الکبر من بطر الحق وغمط الناس ) رواە مسلم . واتە : بێگومان خوا جوانە و جوانیی خۆش دەوێ ، خۆبەزلگری حەق نەسەلماندن و پێشێل کردن و خەلك بەکەم سەیرکردنە .

١٠- زیادەڕۆیی کردن لە قسەو خەوو خۆراك دا

یەکی دیکە لەو ڕەوشتە دزێوانەی کە پێشمەرگەی ئیسلام خۆیان لێ دەپارێزی بریتییە لە زیادەڕۆییکردن و سنوور بەزاندن لە قسەکردن و نووستن و خواردن و خواردنەوەدا ، چونکە پێشمەرگەی ئیسلام

بەپێچەوانەی باباى نامسوڵمانەوە سوورا و سوور دەزانێ کە جەستە، ولاخی سوارێ و ... خزمەتکارێ رووحەو پێویستە پەنی بەئەندا زەی پێویست و بۆ بەرێوەچوونی داخوازێو داوا کارێ یەکانی جێبەجێ بکات، دەنەبێ زیادەڕۆیی کردن لە جێبەجێکردنی داواکارێ و پێداویستی یەکانی لەش دا بە زیانی عەقڵ و رووح تەواو دەبێ، هەربۆیەش خودا فەرموویەتی : ( وکلوا واشربوا ولاتسرفوا انه لایحب المسرفین ) الاعراف / ۳۱ . واتە : وە بخۆن و بخۆنەوەو زیادەڕۆیی مەکەن، بێگومان خودا زیادەڕۆیانی خۆش ناوێن .

بەلێ پێشەرگەی ئیسلام لە کەلیشن دا نەهێ و بەئەندازەی پێویست نەبێ قسە ناکات، چونکە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی : ( من کان یؤمن بالله والیوم الآخر فلیقل خیرا أو لیصمت ) متفق علیه

وە بەئەندازەی پێویست نەبێ نانوێ .. چونکە نووستن برای مردنیەو لە رادەی

پێویست بەولاوە دەبێتە هۆی سست کردن و ..
کوڵ کردنی عەقڵ و تەپلۆس کردن و خاو
- کردنی جەستە .
وە بەئەندازەی پێویستی و بەرێوەچوون
نەبێ نا خوا و نا خواتەوە . وەك پێشتر
گوتمان بۆیە دەخوات تا بژی نەك بەپێچە
- وانەوە ، دیسان دەزانێ کە دەبێ مرۆڤ
بەس هێندەی بخوات کە خواردنەکە
هەڵیگرێ و پشتی را بگرێ ، نەك هێندەی
بخوات کە ئەو خواردنەکەی هەڵگری و
هەموو گەدەی دا بگرێ !!
١١- زیادەڕۆیی‌کردن لە پێکەنین و گاڵتەو
جەفەنگ دا
پێشمەرگەی ئیسلام بابایەکی ئامانج
دارەو هەڵگری بەیامێکەو ڕێبواری ڕێ یەکی
سەخت و دژوار و دوورو درێژەوە ، بەخۆی
ڕەوا نابینێ کە تەمەنی خۆی لە قسەی
حەللەق و مەللەق و بێسەرو بێ گاڵتەو
جەفەنگ و پێکەنینی بێتام و خوێ دا سەرف
بکات ، چونکە دەزانێ کە هەموو ئەمانە
لەسەر حیسابی بە ئامانج گەیشتنی و پەیام

پاکەبا ندنیو ڕێ بڕینی تەوا و دەبەن و چەند پزمارێکی زلن لە چوارچێوەی تەمەنی دەبڕێن و بڕزی پێ دەبەن و لەنێوی دەبەن .

هەڵبەتە ناڵێین پێشمەرگەی ئیسلام دەبێ هەموو دەمێ ڕووگرژو مۆن و مرج و قسەناخۆش بێو قەت زەردەی نەیەتە سەر لێوان ، نەخێر چونکە پێشەوامان محمد صلی الله علیه وسلم هەمیشە لەگەڵ خەڵکیدا ڕووخۆش و دەم بە زەردەخەنە بووەو ، جاروبار وەك ئاوڕشێن کردن شوکتەو قسەی خۆشیشی کردوون ، بەلام یەکەم : نەیکردوە بە عادەت و پیشەیەکی بەردەوام دووەم : قەت لە هەقیو لە سنووری ئەدەب و شەرع نەچۆتەدەری ، وەك فەرموویەتی :( انی لامزح ولا أقول الا .. حقا ) رواه الطبرانی . واتە : بێگومان منیش گاڵتە دەکەم و قسەی خۆش دەکەم بەلام لە هەقێ بەولاوە نایڵێم .

هەڵبەتە زیادەڕۆیی کردن لە پێکەنینو گاڵتەو جەفەنگ دا ، وێڕای ئەوەی کە سزا و

لێپرسینەوەی دوارۆژی لەسەرە لە هەنباش

- دا مرۆڤ تێیدا شووشی ژیان دەبەسێ،

چونکە پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم

دەربارەی زۆرپێکەنین فەرموویەتی : (فإن

كثرة الضحك تميت القلب) رواە ابن

ماجە والقضاعی والدیلمی . واتە :

بێگومان پێکەنینی زۆر دڵ دەمرێنێ .

وە دەربارەی زیا دەڕۆیی کردن لە

گاڵتەو جەفەنگ دا زانایان فەرموویانە

(المزاح يذهب الهيبة) واتە :

گاڵتەو جەفەنگ ڕێزو سام نایەڵێ .

١٢- جگەرەکێشان

وەك لە پێشەوە گوتمان پێشمەرگەی ...

ئیسلام ئامانج و مەبەستی لە جێبەجێکردنی

دا خوازی بێویستیەکانی جەستەی دا بەرێوە

- چوونی بەردەوام بوونی ژیانییەتی ،

واتە پێشمەرگەی ئیسلام کە دەخوا و دەخوا

- تەوەو دەنوێ و بەرگ دەپۆشێ .. هەمند

بۆیە ئەم کارانە ئەنجام دەدات تا کەو

بژی و بەرێوەبچێ بتوانێ ئەرکی

بەندایەتی بەجێبێنێ ، کەواتە هەر شتێك

لە خواردن و خواردنەوەو پۆشاك و خانوو و بەرەو کەل و پەل یا رمەتی بەرێوەچوونـی ژیانی نەدات، بە زیادەی دەزانێ و خۆی پێوە خەریك ناکات، جا بەتایبەتی ئەگەر ئەو شتە شتێکی زیانبەخش و خراپیش بێ و نەك هەر یارمەتی بەرێوەچوونی ژیانیو بەردە وام بوونی نەدات بەڵکو زیانیشی لـێ بدات و پەکیشی بخات وەك (جگەرەکێشان) ئەوە هەرجار خۆی لێ دەپارێزێ.

ئەوە هەمووی لە لایەکەوە لە لایەکـی دیکەشەوە پێشمەرگەی ئیسلام لافی ئەوە لێدەدات کە رێ و شوێنی پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم دەبووژێنێتەوە، خراپەو بێشەرعی لادەبات و دوژمنانی خوا و خەڵك لەنێو دەبات، کەواتە دەبێ یەکەم جار لە خۆیەوە بێدا بیو هیچ جۆرە بێشەرعییەکی گەورە یان گچکە لەخۆی دا نەهێڵێ و لەپێش دا رێ و شوێنی پێغەمبەر لەخۆی دا زیندوو بکاتەوە، بەسەر نزیکترین و گەورەترین دوژمنیدا زاڵ بێ کە نەفسی خۆیەتی، وەك پێشەوامان فەرموویەتی :

( أعدى أعدائك نفسك التي بين يديك )
رواه البيهقي . واته :
دوژمنی هەرە دوژمنت ئەو نەفسەتە کـــە
لەنێو دوو تەنیشتەکانت دا یە .
ئنجا گومانیشی تێدا نییە کە جگەرە
کێشان وەك زانایانی وردبین و قـــوولْ
ڕۆچوو ئەك درشت بین و سەرگێلّـ فەرموو
ـ یانە شتێکی حەرامەو مرۆڤ پێی گوناح
بار دەبێ ، جا ئێمە لێرەدا دەرفەتـــی
خستنەڕووی ئەو هەموو بەلْگانەمان نییە
کە حەرامی جگەرەکێشانیان لێ دەفامرێ
ـ تەوە ؛ بەلاَم لەبەر گرنگی ئەم مەسەلەیە
بەخێرایی هەندێك لەو بەلْگانە دەخەینە
بەرچاوی خوێنەر :
١ـ بێگومان جگەرە وەك تێکرای زانـــاو
پسپۆڕو شارەزایان دەلێن پیس و زیـــان
بەخشەو ، هەموو شتێکی پیس و زیانبەخش
ـ یش بە دەقی قورئان حەرامە وەك ..
فەرموویەتی :( .. يحل لهم الطيبـات
ويحرم عليهم الخبائث .. ) الاعراف ١٥٧
واتە : .. هەرچی چاك و بەسوودە بۆیـان

حەڵاڵ دەكات، وە هەرچی پیس و زیان بەخشە بۆیان حەرام دەكات ..

٤- هەرشتێك سوودی دنیا و دوا ڕۆژی تێدا نەبێ و بەكاری بێنێ یان ئەگەر سوودیشی تێدا هەبێ بەڵام زیاد لە ئەندازەی پێویست بەكاری بێنێ، بە زیادەڕۆیی (الاسراف - التبذیر) لەقەڵەم دەدرێ زیادەڕۆییش بە دەقی قورئان پێشەی شەیتانە، وەك فەرموویەتی: (..ولاتبذر تبذیرا ان المبذرین كانوا اخوان الشیا- - طین ..) الاسراء/ ٢٦-٢٧ . واتە: ... وە زیادەڕۆیی مەكە، چونكە بێگومان زیادەڕۆیان برای شەیتانەكانن ..

ئنجا گومانیشی تێدا نیە كە جگەرە كێشان گەورەترین زیادەڕۆییە هەم لە لایەنی ماڵ سەرف كردنەوە، وە هەم لە لایەنی خواردنەوە، وە هەم لە لایەنی كات بەڕێكردنەوە ...

٣- خۆكوشتن بە دەقی قورئان حەرامە وەك فەرموویەتی: (ولاتقتلوا أنفسكم

ان الله كان بكم رحيما ) النساء/ ٢٩ .
واته : وه خوّتان مه‌كوژن ، بێگومان خوا
له‌گه‌ڵتان به‌به‌زه‌ییه .

ده‌جا گومانی تێدا نیه كه جگه‌ره
كێشان ، وركه و ورده و پله پله‌ییه‌وه
واقیعیش شایه‌ده كه چه‌ندان كه‌س به‌هۆی
نه‌خوشیانه مردوون كه له جگه‌ره‌كێشانه‌وه
په‌یدا ده‌بن .

٤- زیان به‌خه‌ڵك گه‌یاندن حه‌رامه ، چونكه
پێغه‌مبه‌ر صلی الله علیه وسلم فه‌رمووه
-یه‌تی : ( لا ضرر ولا ضرار ) رواه ....
الشافعی وابن ماجه والطبرانی . واته :
زیان له‌خوّدان و زیان له‌خه‌ڵك دان دروست
نیه .

ئنجا ئاشكراشه كه باباى جگه‌ره‌كێشی
ئه‌نداره‌یه‌كی زۆری دووكه‌ڵو ژه‌هره‌كه‌ی
ده‌چێته نێو سیپه‌لاك و هه‌ناوی خه‌ڵكی
-یه‌وه‌و تووشی نه‌خۆشی ده‌بن ، وێڕای
ئه‌وه‌ی كه ده‌شبێته جێی لاساكردنه‌وه‌و چاو
لێكردنی هه‌ندێك كه‌س وه ( الدال علی

الشر كفاعله ) ٠ واته : هەركەسێك ببێتە رێ پێشاندەر بەرەو خراپەیەك وەك ئەوە وایە بۆخۆی ئەو خراپەیەی کردبێ ٠

٥ ـ هەرشتێك زیان و قازانجی هەبێ مادام زیانەکەی پتربێ بە دەقی قورئان حەرامە ، وەك فەرموویەتی :( یسألونك عن الخمر والمیسر قل فیهما اثم كبیر ومنافع للناس واثمهما أكبر من نفعهما ) البقرە/ ٢١٩ ٠ واتە :

دەربارەی ئارەق و قومار پرسیارت لێ دەکەن بڵێ خراپەیەکی گەورەو چەند بەرژەوەندی یەکیان تیدا بۆخەڵکی، بەلام خراپەکەیان لە قازانجەکەیان گەورەترە ٠

هەڵبەتە دواتر خوای کاربەجێ ئارەقو قوماری حەرام کردن وەك فەرموویەتی :

( یا أیها الذین آمنوا انما الخمر والمیسر والانصاب والازلام رجس من عمل الشیطان فاجتنبوه ٠٠) المائدە/ ٩٠ ٠

جا ئەگەر بێت و شتێك زیانی لە قازانجی گەورەتر بێ حەرام بێ

ئاشكرايە كە شتێك زیانێكی رووت بێ و هیچ قازانجێكی نەبێ كە جگەرەیە حەوجار حەوجار حەرامە .

ئەمانە هەندێك لەو بەڵگانە بوون كە حەرامی جگەرەكێشانیان لێ دەفامرێتەوە .

خاڵی حەوتەم : چۆنیەتی هەڵس و كەوتی پێشمەرگەی ئیسلام لە ژیانی رۆژانەی دا

خوای بێ هاوەڵ فەرموویەتی : ( لقد كان لكم فی رسول الله أسوه حسنه لمن كان یرجوا الله والیوم الاخر وذكر الله كثیرا ) الاحزاب / ٢١ . واتە :

بەراستی لە پێغەمبەری خوا دا سەرمەشقی - یەكی چاكتان هەیە ، بۆ هەر كامێكتان كە بەئومێدی خوا و رۆژی دوایی بێ و زۆر یادی خوا بكات .

بەڵێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چاكترین و تەواوترین رابەر و پێشرەوو سەرمەشقە بۆ پێشمەرگەی ئیسلام لە وردو درشتی ژیانیدا ، وە لەراستیدا

ئەرك و ئامانجی پێشمەرگەی ئیسلام بریتیە لە چاككردنەوەو بووژاندنەوەی سوننەت و ڕێ و شوێنی پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم .

ئەمەش چەند نموونەیەك(١) لە جۆرو چۆنیەتی هەڵس و كەوتی پێشمەرگەی ئیسلام :

١ـ خواردن و خواردنەوە

پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم فەرموو یەتی : ( سمّ اللە وكل بیمینك وكل مما یلیك) متفق علیە .

لەم فەرموودەیەدا سێ ڕەوشتی بەرزی نان خواردن خراونەڕوو :

أـ ناوی خودا هێنان لە سەرەتای دەست پێكردنەوە .

بـ نان خواردن بەدەستی ڕاست .

جـ خواردن لەپێش خۆتەوە . ( واتە دەست

---

(١) ئێمە لێرەدا بەس بەكورتی و ڕاپازنە ـ راوی لەو مەسەلانە دەدوێین و شوێنی لێ دوانی تێروتەسەلیان بەشی سێیەمی كتێبی ( مسولمانی كامڵ ) ە .

دریژنەکردن بو ئەملاولای قاپەکە) بێگومان ئەوە لە حالەتێك دایە کە یەکی دیکەت لەگەڵ دا بێت .

ئنجا (ابوداوود و ترمذی) گێڕاویانە - ئەوە کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی : (ئەگەر یەکێکتان لەبیری چوو لەسەرەتای نان خواردنەوە (بسم الله) بکات با هەرکاتێك وەبیری هاتەوە بلێت (بسم الله أوله وآخره).

وە سوننەتە لەکۆتایی نان خواردنەکە - ی دا بلێت : (الحمد لله الذي أطعمني هذا ورزقنيه من غير حول مني ولاقوه). رواه ابوداوود والترمذی .

سیسان سوننەتە کە خواردنی هاتەپێش ئەگەر پێی خۆش بوو بخوات ئەگەر نا زەمی نەکات، چونکە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم قەت عەیبی لە خواردن نەگرتوە. ئەگەر حەزی لێ کردبێ خواردوویەتی دەنا وازی لێ هێناوە . متفق علیه .

وە سوننەتە لەکاتی نان خواردن دا پاڵ نەداتەوە، چونکە پێغەمبەر صلی

الله عليه وسلم فەرموويەتى : ( لا آكل متكئا ) رواه البخاري . واتە : بە پالدانەوەوە نان ناخۆم .

هەروەها سوننەتە بە سێ قامكان بخوات وە كە لێ بووەوە قامكەكانى و ئەو قاپەى كە تێيدا خواردوە بلیسێتەوەو هیچیان پێوە نەیەلێ . رواه مسلم .

دەربارەى خواردنەوەشەوە فەرموودە زۆرن بۆ وێنە :

( یەك یەك كەرەتى - یەكبینە - مەخۆنەوە وەك حوشتری بەلكو دوو و سێ سێ .... بخۆنەوە ، وە لە سەرەتاى خواردنەوەوە ناوى خوا بێنن ، وە كە لێ بوونەوە سوپاسى خوا بكەن ) رواه الترمذى .

٢- دانیشتن لەبەرو مەجلیس دا

پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم فەرموو - یەتى : ( با هیچ كەس پیاوێك لەجێى خۆى هەلنەستێنێو پاشان لەجێى وى دا دانیشى ، بەلكو مەجلیسەكەتان فراوان بكەن و لێك وەدوور بكەون ) متفق علیه .

وە ( جابر بن سمرە ) فەرموويەتى :

( ئێمە کە دەچووینە لای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هەرکا مێکمان لەو شوێنە دا دەنیشت کە دەیگەیشتێ. ) رواه أبودا ود.

وە ( أبوداوود) گێڕاویەتەوە کە ئینسان بۆی نیە لەنێوان دوو کەسان دا دا نیشی مەگەر ئەوان رێ ی بدەن .

وە سوننەتە کە لە مەجلیسی هەستا بڵێ :( سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا اله الا أنت أستغفرك وأتوب اليك) رواه أبوداوود والترمذي . واتە :
ئەی خوایە بە پاکت دەگرم و سوپاست دەکەم شایەدی دەدەم کە جگە لە تۆ چ خودا نین ، داوای لێ بوردنت لێ دەکەم و دەگەڕێمەوە لات .

چونکە پێغەمبەر طى الله عليه وسلم فەرموویەتی ئەم دووعایە دەبێتە مایەی سڕینەوەی ئەو شتانەی کە لەو مەجلیسەدا ڕوویان داوە . رواه أبوداوود .

وە سوننەتە ئینسان کە دەچێتە مەجلیسێکەوە سەلامی بکات، وە هەرکاتێک

مەجلیسەکەی بەجێ هێشت دیسان سەلامی بکات، چونکە سەلام کردنی یەکەمیان چاکتر نیە لەئی دووەمیان، وەك پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی و (أبودا ودو ترمذی) گێڕاویانەتەوە .

٣- نووستن و ڵەخەو هەستان

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کــــە دەهاتە سەرجێی نووستنی لەسەرلای ڕاستی وەردەکەوت و ئنجا دەیفەرموو: (اللهم أسلمت نفسي اليك، ووجهت وجهي اليك، وفوضت أمري اليك، وألجأت ظهري اليك رغبة ورهبة اليك، لاملجأ ولا منجى منك الا اليك، آمنت بكتابك الذي أنزلت ونبيك الذي أرسلت) . رواه البخاري.

واتە : ئەی خوایە خۆم بەتۆ ئەسپارد وە ڕووی خۆم لەتۆ کرد، وە کاروباری خۆم حەوالەی تۆ کرد، وە پشتم بەتۆ بەست، خۆشم دەوێ ی و لێت دەترسم، هیچ پەنا و جێی ڕزگاری نین مەگەر بولای تۆ بێت، بڕوام بەو کتێبەت هێناوە کە ناردووتە .. تە خواری، وە بەو پێغەمبەرەت کــــە

ناردووته .

وە شتێکی چاك نییە ئینسان لەسەر زگ بنوێ، وەك ئبوداوود بومان دەگێڕێتەوە .

وە سوننەتە کە لەخەوێ هەستا بڵێ :

( الحمد لله الذی أحیانا بعدما أماتنا والیه النشور) رواه البخاری . واتە :

سوپاس بۆ خوا یەی کە پاش ئەوەی مراندبوو - پنی زیندووی کردینەوە، وە گەڕانەوەش هەر بولای وی یە .

٤- چاك و چۆنی کردن

( مسلم) گێڕاویەتەوە کە برادەرانی پێغەمبەر صلی اللّە علیە وسلم عادەتیان وابوو پێکەوە تۆقەیان دەکرد .

وە ( ترمذی) گێڕاویەتەوە کە پیاوێك گوتی ئەی پێغەمبەری خوا پیاوێك لە ئێمە دەگاتە برایەکەی یان هاوەڵەکەی ئایا بۆی بچەمێتەوە ؟! فەرمووی نە ، گوتی : ئەدی بەخۆیەوە بگوشیو ماچی بکات ؟! فەرمووی نە ، گوتی : ئەدی دەستی بگری و تۆقەی لەگەڵ بکات ؟ فەرمووی : بەڵێ .

٥ - قسەکردن

پێشمەرگەی ئیسلام لە قسەکردنیدا تالووکەی ناکات و بە پەلەپەل ریزیان ناکات، چونکە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کە قسەیەکی دەکرد سێ جاران دووبارەی دەکردەوە هەتا لێی حالی بن رواه البخاری . وە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم قسەکانی روون و دانەدانە بوون و هەرکەسێك بیستبای تێی دەگەیشت .

رواه أبوداوود .

هەروەها پێشمەرگەی ئیسلام لە هەموو دیزان خۆی ناکاتە ئەسکوێ و لەجێی خۆی دا نەبێ قسان ناکات و خۆی لە ئیشی کەسەوە هەڵنا قورتێنێ، چونکە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی : ( من حسن اسلام المرء ترکه مالایعنیه ) رواه أحمد وترمذی.

ئنجا پێشمەرگەی ئیسلام هەروەك چۆن بەئەدەبەوە گوێ لە قسەی خەڵکی رادەگرێ هەرکا تێکیش قسەی کرد هەوڵ دەدات بارو دۆخێکی وا برەخسێنێ گوێ لە قسەکانی

بگیرێ ، چونکە پێغەمبەر صلی اللە علیـــە وسلم وای دەکرد ، وەك بوخاری و موسلیم بومان دەگێرنەوە .

٦ـ سەروسیما

پێویستە پێشمەرگەی ئیسلام هەروەك چۆن هەموو رەفتارو ئاكارو هەڵس و كەوتێكـی بەپێی سوننەت و رێ و شوێنی پێغەمبەرە صلی اللە علیە وسلم ، سەروسیما و دیمەنیشی هەر بەپێی ئەو نەخشەیە بێ کە رابەرو پێشەوای رەندو پەسندی بۆی کێشاوە .

جا بێگومان سەروسیما و دیمەنی مرۆڤ زۆر شت دەگرێتەوەو لق و پۆپی زۆرن بەڵام ئێمە بەس چەند خاڵێکیان لێ باس دەکەین :

أ ـ پاك و خاوێنی

پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم فەرموویەتی : ( الطهور شطر الایمان ) متفق علیە . واتە :

پاکی نیوەی بڕوایە .

بەڵێ زەق ترین و سەرەکی ترین شت کە پێشمەرگەی ئیسلامی پێ دەناسرێ و پێی لە غەیری خۆی جوێ دەکرێتەوە بریتی یە لە

پاك و خاوێنی؛ پاك و خاوێنی دڵ ودەروون، زمان، لەش، جلو بەرگ .. هتد .

ب ـ ڕووگەشی و زمان شیرینی

پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم فەرموویەتی : ( هیچ شتێك لە چاکە بەکەم مەگرە ئەگەر بەس ئەوەندەش بێ کە بە ڕووی خۆشەوە بگەیە براکەت) رواه مسلم .

دیسان فەرموویەتی : ( وە قسەیەکی چاك و خۆش خێرو چاکەیە ) متفق علیە .

ج ـ سمێل کورت کردنەوەو ڕیش هێشتنەوە

پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم فەرموویەتی : ( أحفوا الشوارب واعفوا اللحی) رواه الشیخان وابوداوود والنسائی . واتە :

سمێڵان کورت بکەنەوەو ڕیشی بهێڵنەوە .

بەڵام زۆربەی مسوڵمانانی ئەمرۆ ڕاست بە بەراوەژووی فەرمانی پێغەمبەرەوە صلی اللە علیە وسلم سمێڵان بەردەدەنەوە وە درێژیان دەکەن هەتا دەچنەوە نێو زاریان، وە ردێنیان لووس دەتاشن !!

ته‌نانه‌ت ئی وایان هه‌یه‌ ویڕای ریشی سمێڵیشیان ده‌تاشی و یه‌کجاری سیماو نیشانه‌ی پیاوه‌تی به‌خۆیه‌وه‌ ناهێڵێ !!

## خاڵی هه‌شته‌م : هه‌ستان و دانیشتنی پێشمه‌رگه‌ی ئیسلام له‌نێو بنکه‌دا

ده‌توانین له‌چه‌ند خاڵێك دا شێوه‌ی هه‌ستان و دانیشتنی پێشمه‌رگه‌ی ئیسلام له‌نێو بنکه‌داو له‌گه‌ڵ براگه‌وره‌و برایانی پێشمه‌رگه‌ی دا روون بکه‌ینه‌وه‌ :

١- گوێ ڕایه‌ڵی و فه‌رمانبه‌ری ( السمع والطاعه )

به‌ڵێ پێشمه‌رگه‌ی ئیسلام بڕواو قه‌ناعه‌تی وایه‌ که‌ له‌سه‌ری فه‌رزه‌ گوێ بۆ فه‌رمانی براگه‌وره‌ی بگرێ و به‌قسه‌ی بکات و له‌ فه‌رمانی ده‌رنه‌چێ ، وه‌ بڕوای وایه‌ هه‌ر کاتێك بێ گوێ یی و بێ فه‌رمانی کرد ئه‌وه‌ تاوانباره‌و خواو پێغه‌مبه‌ری له‌خۆی تووڕه‌ کردوون چونکه‌ پێغه‌مبه‌ر صلى الله عليه وسلم فه‌رموویه‌تی :( من أطاعني فقد

أطاع الله ومن عصاني فقد عصى الله ومن يطع الامير فقد أطاعني ومن يعص الامير فقد عصاني) متفق عليه .

واته : هەرکەسێك فەرمانبەرییم بکات ئەوە بێگومان فەرمانبەری خوای کردوە، وە هەرکەسێك سەرپێچییم بکات ئەوە بێگومان سەرپێچی خوای کردوە، وە هەرکەسێك فەرمانبەری براگەورە بکات ئەوە بێگومان فەرمانبەری منی کردوە، وە هەرکەسێك سەرپێچیی براگەورە بکات ئەوە دیسانەوە سەرپێچیی منی کردوە .

بەڵام ئاشکرایە کە ئەو گوێ رایەڵیو فەرمانبەرییە دەبێ لە جوغزی شەرعدا بێو لە بێشەرعیدا بەقسەی کەس نەکرێ، وەك پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی ( گوێ رایەڵیو فەرمانبەری لەسەر پیاوی مسوڵمان پێویستە لە هەرشتێك دا کە پێی خۆش بێ یان پێی ناخۆش بێ، مەگەر فەرمانی پێ بکرێ بە تاوان و سەرپێچی یەك، چونکە هەرکاتێك فەرمانی پێکرا بە سەرپێچییەك ئەوە نە گوێ گرتن دروستەو

نه بەقسەکردن) متفق علیه .

آ- گەورەو گچکایەتی

هەرچەندە پێشمەرگەی ئیسلام دەزانێ کە ئینسانەکان لەوەدا کە هەموویان مرۆڤن و لە یەك باب و دایك وەپاش کەوتوون و خاوەنی یەك جۆرە سروشتن و پەیوەندەی خودایەکن ، وەك دەنکەکانی شانە یەکسانن و بەرزی و نزمییان نیە ، بەلام لە هەمان کاتیش دا لەچەند لایەنێکی دیکەوە و بەچەند ئیعتیبارێکی دیکە بڕوای بەوەش هەیە کە لەنێو مسولمانان دا بەرزیو نزمی و گەورەو گچکایەتی هەیە بۆ وێنە :

أ- لایەنی زانیاری :

خودا فەرموویەتی : ( قل هل یستوی الذین یعلمون والذین لایعلمون ؟..) الزمر/ ٩ .

بلێ : ئایا ئەوانەی دەزانن و ئەوانەی نازانن یەکسانن ؟!

ب - لایەنی ژیری

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی : ( لیلینی منکم أولوا الاحلام والنهی ثم الذین یلونهم ثم

الذين يلونهم ) رواه مسلم . واته :
با خاوەن هۆش و عەقڵەكانتان لێمەوە نێزیك بن ، ئنجا ئەوانەی لەدوایانەوە دێن ، دوایی ئەوانەی كە لەدوایانەوە دێن.

ج - پاریزكاری

خوای زانا فەرموویەتی :( ... ان أكرمكم عند الله أتقاكم .. ) الحجرات / ١٣ .
واتە : .. بێگومان بەرێزترتان لەلای خوا پاریزكارترتانە ..

د - رەوشت بەرزی

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی :( بێگومان ئەوانەتان كە رەوشتیان جوانترە لەلام خۆشەویستترن و لە رۆژی دوایی‌دا لە پلەوپایەو جێوری‌دا لێم نێزیكترن ) رواه الترمذی.

ه - دەست پێشخەری پەتی ( السابقیه )

خوای كاربەجێو دادگەر فەرموویەتی :
( والسابقون السابقون أولئك المقربون) الواقعه / ١٠- ١١ . واتە :
وە دەست پێشخەران ، دەست پێشخەران ئەوانەن - لەخوا - نیزیكان .

بیان فەرموویەتی :( لایستوی منکم من أنفق من قبل الفتح وقاتل أولئك أعظم درجە من الذین أنفقوا من بعد وقاتلوا ) الحدید/ ١٠ . واتە :

ئەوانەتان کە لەپێش گرتنی شاری مەککەدا ماڵیان خەرج کردووە و جەنگیان کردووە ،لەگەڵ ئەوانەدا یەکسان نین کە لەدواییدا ماڵیان خەرج کردووەو جەنگیان کردوە- لەرێی خوادا - ئەوان پلەیان مەزن ترە لەوانەی دوایی - .

و - تەمەن زۆری

پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم فەرموویەتی :( لیس منا من لم یرحم صغیرنا ویعرف شرف کبیرنا ) رواه الترمذی وأبوداوود . واتە :

هەرکەسێك بەزەیی بە گچکەمان دا نەیەتەوە و ، رێزی گەورەمان نەزانێ لەئێمە نیە .

بەڵێ چا پێشمەرگەی ئیسلام هەرکەسێك یەکێك لەم ئیمتیازانەی تێدابێ رێزو حورمەتێکی تایبەتی بۆ دادەنێ ، لەبەر ئەوەی ئایین و بەرنامەکەی وای فەرمان

پێ دەکات ، بەلام نابێ لەوەش پێشەنگا بین
کە کەسانێك ئەو پلەو ئیمتیازانەیان
تێدا هەن ، نابێ بۆخۆیان خۆبەسەر
خەلکیدا هەلکێشن و هەول بدەن بە
تۆبزی ڕێزو حورمەت لەخەلکی بستێنن ،
بەلکو دەبێ خەلکەکە بۆخۆی ئەو هەستەی
هەبێ .

گەواتە لە بنکەی پێشمەرگەکانی
ئیسلامدا با بایەك کە زانیاری یان تەقوا
یان عەقلێکی زیادەی پێوە شك دەبەردرێ ،
بە پارتەقای ئەو زانیاری و تەقواو بیرو
هۆشە زیادەیە زیادەرێزێکی لێ دەنرێ ،
هەروەها لە بنکەیەك دا کە پێشمەرگەیە
- کانی بە پێشمەرگەی ئیسلام لەقەلەم
دەدرێن با بایەك کە زابردوو و دەست
پێشخەری هەبووە لە خزمەتی ئیسلامو
جیهاد کردن دا لە غەیری خۆی بەستە
لەپێش تر تەماشا دەکرێ ، وە کەسێك
تەمەنی هەلکشیوتر بێ بەئەندازەی
هەلکشیوی ی تەمەنەکەی ڕێزو حورمەتی

پشری بو دا دەنری، هەروەها کەسێك پلەو ئیمتیازێکی تایبەتی هەبێ لە خوو و خدەو ڕەوشتی بەرزدا، ڕێزی تایبەتیشی هەیە وە هەرووەها ...

٣- خۆنەبواردن و خۆ تێك نەبەستن (١)

پێشەمەرگەی ئیسلام لەسۆنگەی ئەوەوە کە بۆخوا ئیش دەکات و ئامانج و مەبەستی وەدەست هێنانی ڕەزامەندی خودایە، لە هیچ ئیش و کارێکی خێروچاکە کە لە برستی - دا بێ دریغی ناکات و خۆی نابوێری و خۆی دەکەس نابەستێ، بەلکو هەوڵ دەدات .. هەرچی زیاتر خێرو پاداشتی بۆ بنووسری بەهۆی راپەراندن و بەجێهێنانی ئەرك و کاروبارەوە، وە لەراستیدا پێشەمەرگەی ئیسلام خزمەت کردن و کاروبار راپەراندن بە مەیدانی پێش برکە (مسابقە) دادەنێ

(١) خۆتێك بەستن بەوە دەگوتری کە کۆمەڵێك ئیشێکیان بەئەستۆوە بێو هەرکامێکیان چاوی لەوانی دیکەوە بێو چاوەڕوانی بکات دا خوا کەنگێ دەیکەن، بەم جۆرە ئیشەکە بکەوێتەوەو نەکری، لەزاراوی (پێریستی (منطق) یش دا ئەمە (دور) ی پێ دەگوتری.

چونکە خودا فەرموویەتی :

( سابقوا الی مغفرە من ربکم وجنە

عرضها کعرض السماء والارض .... )

الحدید/ ۲۱ . واتە :

وە پێش برکە بکەن بەرەولای لێبوردنێك لە پەروەردگارتانەوە ، وە بەرەولای بەهەشتێك کە پانایییەکەی هێندەی پانی ئاسمان و زەوی یە ....

بەڵێ پێشمەرگەی ئیسلام خۆبوێر نیە چونکە دەزانێ چەندە حەوجێی پاداشتێکە کە بەهۆی خزمەت کردن و کاروبار راپەراندنەوە پێی دەبرێ ، وە خۆشی لەخەڵکی نابەستێ بەڵکو دەست پێشخەری دەکات و پێش برکە دەکات کە لەپێش خەڵکیدا دەست بگەیەنێتە شتێك کە کرێ و قیمەتی لێبوردنی پەروەردگارو بەهەشتی بەرینە .

٤ـ گرنگیدان بە پاك و خاوێنی

یەکی دیکە لەو خوو و رەوشتانەی کە پێشمەرگەی ئیسلام لەژیانی پێشمەرگایەتیو لەنێو بنکەدا رەچاوی دەکات بریتییە لە گرنگی دان بە پاك و خاوێنی .

خوای زانا فەرموویەتی : ( ان اللە یحب التوابین ویحب المتطهرین ) البقرە/ ٢٢٢ . واتە :

بەڕاستی خوا تۆبەکەرانی خۆش دەوێن وە خۆپاککەرەوانی خۆش دەوێن .

پێغەمبەریش صلی اللە علیە وسلم فەرموویەتی : ( الطهور شطر الایمان ) رواە مسلم . واتە :

پاك و خاوێنی نیوەی بڕوایە .

هەروەها فەرموویەتی : ( والنظافە تدعوا الی الایمان ، والایمان مع صاحبە فی الجنە ) رواە الطبرانی .

واتە : وە پاك و خاوێنی ئینسان بانگ دەکا بۆ بڕوا ، وە بڕواش لەگەڵ خاوەنە - کەی لەبەهەشتێ دایە .

هەڵبەتە ئەو پاك و خاوێنییەش پێویستە لەهەموو شتێك دا رەچاو بکرێ ، واتە پێشمەرگەی ئیسلام دەبێ لەهەموو شتێك دا پاك و خاوێن بێ :

أ- دڵودەروونی :

کە ڕێ بەو خەسڵەتە پیسانە نەدات کە وەك زبڵوزاڵ دەروونی پیس دەکەن وەك :
بەدگومانیی ( سوء الظن ) ، ئیرەیی( حسد ) ، ڕژدی ی ( بخل ) ، خۆبەزلگری ( کبر ) ..هتد .
ب ـ زمانی :
کە بیپارێزێ لەوەی قسەیەکی پێ بکات بنەتووی خۆی نەکاتەوە ، یا خود سەرەڕای بنەتوو نەکردنەوە لەسەریشی قسەرزدار بێتەوە ، وەك : درۆ ، بوختان ، غەیبەت ، خۆهەڵدانەوە ، توانجو پلار ، بەخۆدا شکاندنەوە ، ناوونا تۆرە هەڵدان ، سوێند خواردن بەغەیری خوا ، سوێند بەخوا خواردنی بەدرۆ ، قسە هێنان و بردن ، جنێوو قسەی ناشیرین .. هتد .
ج ـ زار :
کە بیپارێزێ لە شتی بۆن ناخۆش وەك : تووروو پیوازو سیر ، چونکە پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم فەرموویەتی : ( هەرکەسێك پیوازو تووروو سیری خوارد با نیزیکی مزگەوتەکەمان نەبێ .. ) رواه مسلم .
هەڵبەتە بۆ خەڵتەی جگەرەش ئەگەر لە

بوشی توورو پیوازو سیر نا خۆشتر نەبێ خۆشتر نیە ، سەرەرای ئەوەی کە خەرا میشە وەك پێشتر باسمان کرد .

ئنجا ئیسلام کە سیواك کردنی ... بە سوننەتێکی گەورە دانا وە، هەر بە مەبەستی پاك راگرتنی زارە . (١)

د - جەستە :

پاك راگرتنی جەستەش بە سێ شتان پێك دێ :

یەك : شۆردنی ، هەربۆیەش پێشەوامان فەرموویەتی : ( ما فی خوایە لەسەر هەموو مسولمانێك کە هەموو حەوت رۆژێك خۆی بشوات، سەری و لەشی بشوات) متفق علیە .

دوو : پاك راگرتنی جلوبەرگ وەك رابەرمان فەرموویەتی :( من اتخذ ثوبا فلینظفە ) رواە الطحاوی . واتە : هەرکەسێك بەرگێکی دەبەرکرد با پاکی بکاتەوە .

---

(١) پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم دەربارەی سیواك فەرموویەتی: ( السواك مطهرة للفم مرضاة للرب ) رواە النسائی واتە: سیواك پاك کەرەوەی زارەو رازی کەری پەروەردگارە .

سێ : خۆ بۆن خۆشکردن : هەربۆیەش پێغەمبەرمان صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی :( خۆشۆردن و خۆبۆن خۆشکردن و سیواك کردن، لە ڕۆژی جومعەدا لەسەر هەموو مسوڵمانێك پێویستە ) رواه أحمد .

ه - شوێنی تێدا نیشتەجێ بوون

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەو بارەوە فەرموویەتی :( فنظفوا أفنیتکم ولا تشبهوا بالیهود) رواه الترمذی .
واتە : جا بەرو پێش دەرگاتان خاوێن ڕاگرن و لاسای جوولەکەکان مەکەنەوە - لە پیس و پۆخڵیدا - .



تێبینی :

لەسەر پێشمەرگەی ئیسلام پێویستە کە دەوروبەری شوێنی تێدا ژیانیشی پاك ڕابگرێ، بۆ وێنە نابێ زبڵوزاڵ لە نزیك بنکەکانەوە فڕێ بداتە وە نابێ لە نزیك بنکەکان تارەت بگرێ !!!

٥ ـ دوا نەکەوتن لە کاتی دیاری کراوی نوێژ، دەرس خوێندن، نان خواردن ئێشکەگرتن .. هتد :

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی : ( ان الله یحب اذا عمل أحدکم عملا أن یتقنه ) أبویعلی والعسکری.
واتە : بێگومان خوا پێی خۆشە ئەگەر یەکێکتان ئیشێکی کرد بە رێك و پێکی بیکات .

هەڵبەتە سەرەکی ترین مەرجی رێك و پێکی و وردەکاریش، ئەوەیە کە ئەو کارە لە کاتی دیاری کراوی خۆی دوا نەکەوێ .

بەڵێ پێشمەرگەی ئیسلام بەرلەوەی کاتی نوێژ بێت خۆی ئامادە دەکات، تاکو فریای بکەوێ و لەکاتی خۆی دا بیکات، هەروەها دەرس خوێندن و نان خواردن و ئێشکە گرتنیش بەهەمان شێوە، چونکە دوا کەوتن لە جێبەجێکردنی هەر ئیشێك دا بەهۆی نەتوانین و تەنبەڵی و قالب گرانی یەوەیە، پێشمەرگەی ئیسلامیش هەموو دەمێ وەك گورزی

بێزراو چاڵاك و گورج و گوڵو ئامادەیەو

دا یموودەرەم لەخوا دەپارێتەوە ( اللهم انی أعوذ بك من الهم والحزن والعجز والكسل .. ) رواه الشيخان وأحمد .

واتە : ئەی خوایە من پەنا ت دێنمە بەر لە خەفەت و دڵ تەنگی و تەنوا نین و تەنبەڵی .

٦- ئێشکەگرتن ( الحراسە )

ئێشکەگرتن و پاسیکردن لە بەرشامەی خوادا ، پاداشتێکی یەکجار بەرزو پیرۆزی هەیەو کارێکی زۆر گرنگ و بایەخدارە ، پێغەمبەر صلی اللە علیه وسلم فەرموویەتی ( عینان لا تمسهما النار عین بكت من خشیه اللە وعین باتت تحرس فی سبیل اللە ) رواه الترمذی . واتە :

دوو چاو ئاگریان نووش نابێ ، چاوێك كە لە ترسی خوا گریا بێ ، وە چاوێك كە لە رێی خوادا ئێشكەی گرتبێ .

هەڵبەتە پێشمەرگەی ئیسلام بە حوكمی فەرموودەی ( كلكم راع وكلكم مسئول عن رعیتە .. ) الشيخان وغیرهما .

هەمووتان شوانن و هەمووتان لە ئاقسار

کۆمەڵەکەتان دا لێپرسراون، بەس لەو کاتانەدا کە نۆرەی ئێشکچییەتی دەگاتە سەری خۆی بە ئێشکچی لەقەڵەم نادات، بەڵکو هەموو دەمێ خۆی بە چاودێری پاسەوانی ئیسلام و موسڵمانان دەزانێ.

وە سەبارەت بە چۆنیەتی ئێشکەگرتن ئەم ئامۆژگاریانەمان بۆ برایانی پێشمەرگە هەن :

أ- هەرچەندە باباى موسڵمان هەموو دەمێ بەرپرسیارە سەبارەت بە ئیسلام و موسڵمانان، بەڵام بەتایبەتی لە دەمی ئێشکەگرتن دا ئەو بەرپرسیاریەی دووچەندانەو چەند چەندانە دەبێتەوە، چونکە لەو دەمەی‌دا چارەنووسی ئیسلام و موسڵمانان و ئابرووـیانی پێ سپێرراوە !!

ب- باباى ئێشکچی نابێ لەخەم تۆزە ئەزیەتێکەوە بێ و لەبەر لەش تەڕنەبوون یان سەرمانەبوون وەك داوەڵ لە جێیەکی دیاری کراودا راوەستێ، بەڵکو دەبێ هەر چاوێکی بکاتە چوار چاوو لە شوێنێکی وادا خۆی مەڵاس بدات یان راوەستێ کە

ئاگاداری دەوروبەرەکەی بێت، وە نیــوە نیوەش لەکاتی پێویستیدا بگەڕێ و ئەملاو لایان بپشکنێ .

ج ـ نابێ باوای ئیشکچی خۆی بە هیچ شتێکەوە خەریک بکات کە ببێتە هۆی بێ ئاگایی، با ئەو شتە زیکر کردن و ... قورئان خوێندنیش بێ، چونکە ئەگەر مەبە ـ ستی پاداشتە، ئیشکەگرتنەکەی بەمەرجێك بە وریایی‌و بە ڕێك و پێکی بێت لەهەموو شتێك خێرترە .

د ـ نابێ باوای ئیشکچی کە نــــۆرەی دەگاتە سەری و لەخەوی هەڵدەستێنــــرێ تەوەزەلی‌و قالب گرانی پێشان بــــدات و لەبن جێی دا خۆی بگنخێنێ یان بــــە ساردوسڕی خۆی وەپێچێ ، چونکە دوایی هەرشتێك بەهۆی خۆگنخاندنی وی یەوە ڕووبدات هەموو ئۆباڵ‌و تاوانەکەی لە ملی وی یە .

هـ ـ ئەو کەسەی نۆرەی ئیشکەگرتنی خۆی تەواو دەکات و دەیەوێ ئەوەی دوای خۆی وەخەبەر بێنێ نابێ بە خاوو خلیچکی

ئەو کارە بکات و زۆر لە ژووریّ بمێنێتەوە یان زۆر خۆی بە بێدارکردنەوەیەوە خەریك بکات، بەڵکو پێویستە وەك پەوری بەیانی گورج و گۆڵ بێو ئەگەر زانی کابرا بە سێنایی وەخەبەر نایەت با کەت و پڕ پێخەفەکەی لەسەر لابدات و تێکیەوە رابشەقێنێ، بەلام واش نا کە شێتی بکات !!

و- پێویستە برایانی ئێشکچی لەکاتی یەکدی بێدارکردنەوەدا، بەئەسپایی و ئارامی ئەو کارە ئەنجام بدەن و نەیکەنە هات و هاوار و شرم برمێنەو خەو لەوانی دیکە تێك بدەن .

٧- خواردن سازکردن ( خەفەریات )

خزمەت کردنی مسوڵمانان کە جۆرێکە لە سوود پێ گەیاندنیان، بە یەکێك لە گەورەترین شێوەو جۆرەکانی خواپەرستی دادەنرێ، پێغەمبەریش صلی اللە علیە وسلم فەرموویەتی :( خیر الناس من ینفع الناس) القضاعی . واتە :باشترین کەس ئەوەیە کە سوود بەخەڵکی دەگەیەنێ .

دەربارەی چۆنیەتی خواردن سازکردنیش

ئەم ئامۆژگاریی یانەم بۆ برایانی پێشمە

ـ ەرگە هەیە :

أ ـ دەبێ هەوڵ بدات ئەو خواردنەی کە ئامادەی دەکات بە چاکترین و پەسندترین شێوە ئامادەی بکات، دەنا هەر کەم و کوڕی یەك لە خواردنەکەدا هەبێ بەهۆی خۆبواردنی وی یەوە، بەو ئەندازەی خەساربوونی خواردنەکەو کەم و کوڕی یەکەی تاوانبارە .

ب ـ پێویستە خواردنەکە لەگەڵ ژمارەی کەسەکاندا پێکەڵپێك بێ‌و، نە بەهۆی رژدی یەوە کورتی بێنی‌و لەبەریان ببڕێ، وە نە بەهۆی زیادەڕۆیی یەوە لێیان زیاد بێ‌و خەسار بێ .

ج ـ پێویستە خواردنەکە لەکاتی دیاری کراوی خۆی دا، نە زووتر، نە درەنگتر ئامادە بکات .

د ـ پێویستە لە شۆردنی مەنجەڵو قاپ و کەوچکەکاندا ئەوپەڕی پاك و خاوێنی رەچاو بکات و کەمتەرخەمی نەنوێنێ، هەروەها سفرەی نان لەسەر خواردن چاك پاك بکاتەوە .

هـ ـ پێویستە ئەوپەری دادگەری بەکاربێنێ لە دابەش کردنی خواردنەکەدا و مەگەر بۆ تام و خوێ زانین، دەنا تاقە پارویێک پێش کاتی نان خواردن نە بخوات نە بدات بە کەس .

و ـ ئەگەر گەسێک لێدانی زووریش عادەتی بێ پێویستە هەوڵ بدات لە نوورەی وی دا زوورەکە یەکجار پاک بیسێت و، بابای نوێژکەر لەکاتی کڕنووش بردن دا سەری سەتحی نەبێ و نەزانێ لەبەهەشت و خال سەر لەکوێ دانێ !!

ز ـ نابێ لە بەرانبەر خزمەت کردنەکەیدا ترومنەت بەسەر برادەرانیدا بکات و خزمەتەکەیان بەچاوان دا بداتەوە، چونکە یەکەم ئەرکی سەرشانی خۆی جێبەجێ کردوە، دووەم پاداشتی لای خوایە .

تێبینی :

لە باسەکانی پێشەوەدا گوتمان پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم قەت عەیب و رەخنەی

لە خواردن نەگرتوە، ئەگەر حەزی لـێ کردبێ خواردوویەتیو ئەگەر نا وازی لـێ هێناوە، کەواتە نابێ هیچ کام لە برایانی پێشمەرگە لەکاتی هەبوونی کەم و کوڕی دا دەست بکەن بە رەخنەو توانج و پلار دەربارەی باباى خواردن سازکەر، چونکە دڵ بریندارکردنی مسوڵمان تاوانەو پێم وا نیە هیچ کەسیش حەز بکات پەرێزو بەرهەم و کردەی دەستی خراپ و ناتەواو بێ، وە ئەگەر گریمان باباى خواردن سازکەر بە هۆی کەمتەرخەمیشەوە خواردنەکەی ناتەواو و دەرچوو بێ ئەوا هەموو کەس بۆی نیە گلەییو گازندە دەربڕێ و برا گەورەو لێپرسراوی بنکە بەو کارە هەڵدەستێ .

٨- وریا بیو چەك لەخۆ نەكردنەوە

یەكی دیكە لەو ڕەوشتە پەسندانەی كە پێشمەرگەی ئیسلامیان پێوە دەناسرێ ئەوەیە كە هەتا بەخەبەربێ لەكاتی شێنەیی‌دا ، وە ئەگەر نووستوش بێت لەكاتی مەترسی‌دا چەك لەخۆی ناكاتەوەو هەموو دەمێ وریاو ئامادەیە ، چونكە خودا بە برادەرە بەڕێزەكانی پێغەمبەری فەرمووە : ( .. ولا جناح عليكم ان كان بكم أذى من مطر أو كنتم مرضى أن تضعوا أسلحتكم وخذوا حذركم .. ) النساء / ١٠٢ . واتە :

.. وە ئەگەر ئازاریكتان هەبوو بەهۆی باران - و لەش تەڕبوون - ەوە یا خود نەساغ بوون،گوناحتان ناگاتێ كە چەكەكانتان دانێن ، وە ئامادەیی خۆتان وەربگرن ..

وەك دەبینین ( لا جناح عليكم ) بەس دوو حالەتی بۆ دیاری كراون، كەوا بێ لە غەیری دوو حالەتەدا پێشمەرگەی ئەو

ئیسلام گوناحی دەگاتێ چەك لەخـــۆی بکاتەوە . (١)

٩ـ خزمەت کردنی چەك

چەکی دەستی پێشمەرگەی ئیسلام موڵکی ئیسلامەو ، هەر جۆرە کەمتەرخەمییەك لە خزمەت کردن و پاك راگرتنیدا ، دەبێتە مایەی تاوانباری ، چونکە ناپاکی کردن لەگەڵ سپاردە ( أمانە ) دا تاوانێکی یەکجار زلە .

جا پێشمەرگەی ئیسلام لە خزمەت کردنی چەکەکەی دا زۆر خەمخۆرو بەمشـــوورەو دەزانێ کە تەشبەلێ کردن لە خزمەتکردنی چەکەکەی دا لە دوو لاوە گوناحبـــاری دەکات :

أ ـ کە ناپاکی لەگەڵ سپاردەدا کـــردوەو زیانی بە ئیسلامو مسولمانان گەیاندوە .

ب ـ کە بەهۆی خزمەت نەکردنی چەکەکەیەوە

---

(١) ئەو حوکمە لە چەمکی پێچەوانەی ( مفهوم المخالفە ) ی ئایەتەکە وەردەگیرێ و ، پێم وا نیە هیچ گـــرێ و گۆڵیشی تێدا بن .

زۆر نیزیکە لە ناسك ترین كات دا ، لەكاتی بەرەنگاربوونی دوژمن دا چەکە خزمەت نەکرا - وەکەی دەفریای نەیەت و باری بنەوەی پێ ببرێ و دەستەوکەری پێ نەکرێ و چەکەکەشی بە زمانی حال پێی بڵێ : ئەگەر خزمەتت کردبام خزمەتم دەکردی ، بەلام بیخەو عافیێتت بێ !!

١٠- دەست لەچەك وەرنەدان لەنێو خەڵکیدا

کە دەڵێین پێویستە پێشمەرگەی ئیسلام خزمەتی چەکەکەی بکات ، مانای ئەوە نییە هەموو دەمێ بیکاتە بووکە شووشەو هەڵی پەرێنێو دەستی تێ وەربدات ، بەڵکو پێویستە پێشمەرگەی ئیسلام بەبێ پێویستی دەست لە چەکەکەی وەرنەدات بەتایبەتی لەنێو خەڵکیدا ، دەنا هەر شتێکی لەدەستی بقەومێ مادام کەمتەرخەمی کردبێ موستەحەقی سزای دنیا و دوارۆژە .

١١- چەك رانەداشتن بەرەو رووی یەکدی

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموو - یەتی : ( لا یشیر أحدکم الی أخیه بالسلاح .. ) متفق علیه . واتە :

هیچ کامتان چەك بەرەو ڕووی برا یەکەی ڕا نەدێرێ ..

هەروەها فەرموویەتی : ( من أشار الى أخیه بحدیده فان الملائکه تلعنه حتی وان کان أخاه لابیه وأمه ) رواه مسلم .

واتە : هەرکەسێك تیغێك بەرەو ڕووی برا یەکەی ڕا دێرێ ئەوە فریشتەکان نەفرینی لێ دەکەن تەنانەت ئەگەر برای دایکی و باوکیشی بێ .

خالی نۆیەم : شێوەی ڕەفتارکردنی پێشەوا لەگەڵ میوان دا

ڕێزگرتنی میوان یەکێکە لە ڕەوشتە بەرزەکانی ئیسلام و ئەرکی سەرشانی هەموو مسولمانێکە ، پێغەمبەر صلی اللە علیه وسلم فەرموویەتی :

( من کان یؤمن باللە والیوم الآخر فلیکرم ضیفه .. ) متفق علیه . واتە : کێ بڕوای بەخوا و ڕۆژی دوایی هەیە با ڕێزی میوانەکەی بگرێ .

جا بەرلەوەی بێینە سەر باسی ڕوونکرد نەوەی چۆنیەتی هەڵوێستی پێشمەرگەی ئیسلام لەگەڵ هەریەك لەو جۆرە میوانانەی كــە دێنەلای، چەند ئامۆژگاری و ئاگاداری یــە ـ كــی گشتی دەربارەی ڕێزگرتنی میــوان دەخەینەڕوو :

یەك : پێشوازی كردن و بەپیرەوەچوون

سوننەتە كە میوانت هات بەپێــــــی لێوەشاوەیی‌و هەڵگرتنی ئەو مــــــیوانە پێشوازی لێ بكەی و بەپیریەوە بــچــــی، چونكە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلــــم جارێكی زەیدی كوڕی حاریثە لە سەفەرێــك گەڕایەوەو هاتە خزمەتی‌و لەدەرگای دا .. ئەویش هەستا بەپیریەوەچوو، و عەبا یەكەی لەدوای خۆی رادەكێشا .. رواه الترمذی .

دوو : ڕووخۆش بوون

وەك لە پێشتردا باسمان كرد یەكــێك لەو شتانەی سیما و دیمەنی مرۆڤــــــی مسوڵمانیان پێ دەناسرێ بریتی‌یە لـــە ڕووخۆشی‌و گفت ولفت شیرینی، ئنجـــــــــ بەتایبەتی لەگەڵ میوان دا .

سێ : تۆقەکردن

وەك پێشتر خستمانەڕوو تۆقەکردن لەنێو مسوڵمانان دا سوننەتەو لەگەڵ میوانیش دا حەوجار .

چوار : دانیشتاندنی لەلای سەری

واباشە خانەخوێ قەت لە میوانەکەی وەپشت نەکەوێ و لای سەرێ ی لێ نەگرێ ، چونکە بەگوێرەی عورف و عادەتی خەڵکی کێ بەرێزتر بێ پتر لای سەرەوەی مەجلیس دەگرێ .

پێنج : پەلە کردن لە خواردن و خواردنەوە پێدانی دا :

بابای رێبوار مەگەر چۆنەکا بێ دەندا تینوو و برسییە ، جا چاکتر وایە دەستبەجێ خواردن و خواردنەوەی بۆ سازبکرێ با کاتی ( ژەم ) یش نیزیك بێ ، مەگەر بۆخۆی بڵێ جارێ ناخۆم .

شەش : چاوتێنەبرینی لەکاتی نان خواردندا

شتێکی ناشیرینە کە بابای خانەخوێ لەکاتی نان خواردن دا چاو لە دەستی میوانەوە ببرێ و وا پیشان بدات کە

چاودێریەتیو، ئەویش وای بێتە بەرچاو
که پارووەکانی دەژمێرێ !!
حەوت : سەغڵەت نەکردنی بەهۆی قسەو
پرسیاری بێجێ وە
میوان دەپرسیاران گرتن و تەنگاوکردنی
بەهۆی پرسیاری نابەجێو سەغڵەت کەر
( محرج ) ەوە، شتێکی زۆر ناقۆڵایە
لە پێشمەرگەی ئیسلام ناوەشێتەوە .
هەشت : دەورە چۆل نەکردنیو بەتەنیا
بەجێنەهێشتنی
واچاکە هەموو دەمێ بەکێك یان زیاتر
لە برادەرانی پێشمەرگە لەلای میوان
دانیشن و بەتەنێ بەجێی نەهێڵن، چونکە
ئەو ڕەفتارە بۆنی گرنگی پێ نەدان و بێ
ڕێزی ی لێ دێ .
نۆ : دم بەدمە لەگەڵ نەکردنیو هەستپاراستنی
وا باشە خانەخوێ هەتا بۆی دەکرێ لەگەڵ
میوان دا شەڕەقسەو دم بەدمە نەکاتو لە
دەماری نەداتو هەست و نەستی بریندار

نەکات، بەلام ئەگەر ئەو بارودۆخێکی وای هێنا یەپێش کە ناچاری کردی، ئەوە خوای دەکرد هەتا وەدڵ برینداربوونێ رادەگات لەت و پەتیش دەبوو، پێویستە رێك و راست هەقی بخرێتە بەرچاو و بۆی لەبنسی کووڵەکەی بدرێ .

دە : لەگەڵ چوونەدەرەوەی و بەرێ کردنی

وا باشە لەکاتی رۆیشتنی میواندا بە ئەندازەی هەڵگرتن و لێوەشانەوەی بەرێزە وە بەرێ بکرێ و کەسێك یان پتر نەختێك لەگەڵی بڕوات .

ئێستاش دێینە سەر باسی چۆنیەتی رەفتارکردنی پێشمەرگەی ئیسلام لەگەڵ هەر کام لەو جۆرە میوانانەدا کە دێنەلای، کە بە بڕوای من لە پێنج جۆران دەرناچن :

١- شوێن کەوتووی حیزبە نائیسلامییەکان وێڕای رەچاوکردنی ئەو(١٠) خاڵەی کە رابردن، پێویستە پێشمەرگەی ئیسلام هەوڵ بدات بەر لە زمانی وتار، بە زمانی حاڵ و واقیع و رەفتار ئیسلامێکی رێك و راست بخاتە بەرچاوی و، بەپێی بولوانیش

خۆی لەو جۆرە باسانە بپارێزێ کە سەردەکێشن بۆ دم بەدمەو شەڕە دەندووکە، مەگەر لە حاڵەتی زۆر ناچاری دا، دەنا بەهیچ شێوەیەك ڕاستەوخۆ لە بیروباوەڕو هەست و نەستی نەدات، چونکە یەکەم وەك میوانێك مافی هەست و نەست پارێزرانی هەیە، دووەم: (خودا فەرموویەتی:

( ولا تسبوا الذين يدعون من دون الله فيسبوا الله عدوا بغير علم..) الانعام/ ١٠٨/. واتە:

وە جنێو بەو شتانە مەدەن کە لەجیاتی خوا دەیانپەرستن، دەنا ئەوانیش بە نەزانی ی خەتێ خواردەکەن و جنێو بە خودا دەڵێن.

بەلام ئەمە لە حاڵەتی ئاسایی دا، دونا ئەگەر هات و بارودۆخەکە ناچاری کردی وەك ئەوەی ئەو هێرش بکاتە سەر ئیسلام و تۆمەتی نەفامانەی پاڵدا تەلا، ئەوە لە حاڵێکی وادا حورمەتی میوانایەتی خۆی شکاندوەو بۆتە هێرش بەر( مهاجم)، هەڵبەتە باپای هێرش بەریش دەبێ بەر

پەرچی بدرێتەوە، چونکە ( جوابی ئەحــــــە پەحــەیە ) .

آ- کەس و کاری پێشمەرگە

کەس و کاری پێشمەرگە هەرکەسێکی بێو هەرچۆنێکی بێ یەکەم لەبەر میوانایەتـــی، دووەم لەبەر دڵ راگرتنی، برای پێشمەرگەە پێویستە ئەوپەری نەرمیو هیواشی لەگەڵ بەکاربهێنرێ وە ئەگەر غەڵەت و پەڵەتانـ - یش بکات پتر لای لێبووردن و چاوپۆشی بگیردرێ، هەتا وەلامدانەوەو دەمکوت کردنی، بەلام بەمەرجێك لەتامی نەباتە دەرێ ...

کوردیش گوتویانە ( هەموو شتێك بەخــــوێ خــوێش بەمەعــنا ) !!

وە واباشە کەس و کاری پێشمەرگە هەوڵی حالی کران و تێگەیەندرانیان لەگــــــەڵ بدرێ و هەوڵ بدرێ قەناعەتیان پێبهێنرێ بە گرنگیو پێویستی ( جـهـاد ) کـردن .

٣- کاروانــچــی

ئەو برادەرە کاروانچیانەی کە بارمان بۆ دێنن ، پێویستە پێشمەرگەی ئیسلام لـــە دوور رابەپیریانەوە بچیو ڕێشمـــــــــــەی وڵاخەکەیان لێ وەربگرێ وە، بارەکە بخات و

بیباته شوێنی تەرخان کراوی خۆی، و وڵاخە
- کەی ببەستێتەوەو نەیەڵێ بابـــــــای
کاروانچی دەست لە هیچ شتێك بدات و ...
دەستبەجێ بیهێنێتە ژووری و دەست بکات
بە خزمەت کردنی و بەخێر هێنانی و هەواڵ
پرسینی. مەگەر لە حاڵێك دا کە بابـــــای
کاروانچی بۆخوی دڵی ئاوێ نەخوا تـــــبەوەو،
بڵێ بۆخۆم وڵاخەکەم دەبەستمەوەو ئالیکی
دەدەمێ.
٤- بابای نەناسراو
بابای نەناسراویش، وەك هەموو جـــــۆرە
میوانەکانی دیکە بەخێر دەهێنرێ و بــــەو
شێوەیەی کە گوتمان رەفتاری لەگەڵ دەکرێ،
وە ئەوپەری وردی و وریابیو لێزانــی
بەکاردێ لەکاتی قسە لەگەڵ کردن دا، نەوەك
شتێکی لەبن سەری دا بێ یان قسەکــــــان
لەگەڵ وی دا نەگونجێن.
٥- خەڵکی دیکەی ناسراو
خەڵکی دیکەی ناسراو هەرکەسە بەپێی
ئەندازەی عەقڵ و ئاستی حاڵی بوونـــــی و
پێویستی، قسەی لەگەڵدا دەکرێ و بــــــەو

شێوەیەش کە رابرد هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرێ .

تێبینی :

لە هەر بنکەیەکی پێشمەرگەکانی ئیسلام - دا برایەکی وریاو لێهاتوو یان چەند برایەکی وریاو لێهاتوو، تەرخان دەکرێن بۆ گفت و گۆو دوان لەگەڵ میوان داوە. جگە لەوان نابێ کەسی دیکە خۆی لە قسان هەڵقورتێنێ، چونکە ( من حسن اسلام المرء ترکه ما لایعنیه ) رواه أحمد والترمذی .

پێشینانیشمان پەندێکی جەرگبڕیان دانا وە بۆ هەرکەسێك کە خۆی لە ئیشێکەوە هەڵدەقورتێنێ کە لێی ناوەشێتەوەو پێی نەسپێرراوە، دەڵێن :

( دەڵێ ربە شرەیە کەس پێی ناپێوێ لەخۆوە دەڵێ : ئەوە شازدەو نیو) !!

یەکەم : ئێمە چا خواردنەوە بەحەرام نازا
- نین هەرچەندە پێمان وایە کە
جۆرێکە لە زیادەڕۆیی (اسراف) چونکە
ویرای زیان،سوودیشی هەن، بەلام ئێمە
لەبەر چوار هۆیان چا ناخۆینەوە :
١- هەروەك چۆن (طالوت) لە لویێچییەکانی
بەولاوە ئاونەخواردنەوەی لە ڕووبارەکە
کردە مەرجی لەگەڵدا بوونی (ان الله مبتلیکم بنهر فمن شرب منه فلیس منی ومن
لم یطعمه فانه منی الا من اغترف غرفة
بیده) البقرە/٢٤٩ . ئێمەش چانەخواردنە
- وەمان کردوە بەمەرجی پێشمەرگایەتیو
لەگەڵدا بوونمان، جا ئەگەر (چا) زیادە
- ڕۆییو زیانی تێدایە، ئەو ئاوەی کە
طالووت لە شوێن کەوتووانی خۆی قەدەغەی
کرد بەمەبەستی لەبێژینگ دان و تاقی
کردنەوە،یان حەلاڵیکی بێخلتە بوو و هیچ
زیادەڕۆییەکیشی تێدا نەبوو، کەوا تە
ئەو کەسەی کە بەهۆی چا قەدەغەکردنەوە
ڕەخنە لە ئێمە دەگرێ و بەقەستی خۆی

گێل دەکات و دەڵێت( حەڵاڵتان حەرام کردوە ) !! با زۆرچاك بزانێ لەپێش ئێمە ئەو طالووتە دەپێكی كە خودا بە ( زادە بسطە فی العلم والجسم ) البقرە / ٢٤٧ ، وەسفی کردوە !!

٣ـ وەك لەپێش دا گوتمان چاخواردنەوە جۆریکە لە جۆرەکانی زیادەڕۆیی ( الاسـراف ) ، چونکە هەرشتێك بخۆی کە جەستەت پێویستی پێی نەبێو پەکی لەسەری نەکەوتبێ دەچێتە خانەی ( اسراف ) ەوە ، جا بێگومان ( چا ) شتێك نیە کە لەشی مرۆڤ پێویستی پێی هەبێو بەبێی نەژی و بەڕێوە نەچێ ، کەسانێکیش کە بە چاخواردنەوە ڕاهاتوون و بە نەخواردنەوەی ژانەسەری دەگرن و بێ تاقەت دەبن ، ئەوە نابێتە بەڵگە لەسەر حەوجێ پێ بوونی جەستەیان چونکە باباى مەیخۆرەوەو قومارچیو جگەرە کێشیش لەکاتی نەبوونی( مەی و قومارو جگەرە ) دا وەڕەزی و بێ تاقەتیو سەرئێشە ڕوویان تێ دەکات !!

هەڵبەتە خوداش فەرموویەتی : ( وکلوا واشربوا ولا تسرفوا ) الاعراف / ٣١ ،

جا ئێمە دەمانەوێ فەرمانی خوا جێ بەجێ بکەین و زیا دەڕۆیی نەکەین .

ئەوە هەمووی لەلایەکەوە لەلایەکی دیکەشەوە ئێمە لەسوگەی ئەوەوە کە سوپاس بۆخوا پشتمان بەخواو خۆمان و خەڵکی مسوڵمان بەستووەو لەسەر پێی خۆمان ڕاوەستاوین، هەتا سووك مەسرەف ترو بە قەناعەت تر بین چاکتر دەتوانین بەڕێوە بچین و لە منەتی ئەملاو لایانیش دەربچین، بەڵێ ئێمە ئەو پارەیەی کە بە شەکروچاو کەلوپەلی چاخواردنەوەی دەدەین، بە ئاردو برنج و ڕۆنی دەدەین، یان بە چەك و فیشە ـ کی دەدەین، یان بە قاقەزو مەرەکەب و کەلوپەلی چاپی دەدەین و ..هتد چونکە بەبێ چا دەتوانین بژین و بەڕێوەبچین، بەڵام بەبێ ئەم شتانە ژیان و بەڕێوەچوون و بەردەوام بوونمان مەحاڵە .

٣ـ لەڕاستیدا کۆمەڵێك سێجەمە چای بخۆن ـ ەوە لانی کەم ڕۆژی سەعاتێکی تەمەنیان بەئاگری چالێنانی دەسووتێ، لە کتری و قۆری و پیالەو پەرداخی ( چا )دا نقووم

دەبێ ، تەمەنیش دەستمایەی دەستی
شیتانەو حەیفە بەشتێکی بدات کسە
هیچ پێویستی پێی نیە !!
٤- ئێمە لێرە لەمەیدانی جەنگ و خەباتـ
دابین و چاوەڕێی هەموو جۆرە بارو
دۆخێکی سەخت و دژوار دەکەین و، حاڵەتی وا
دێتە پێشێ کە مەودای ئاوخواردنەوەو
نان خواردنیشمان نابێ هەتا وەچا خواردنەوەی را دەگات، ئنجا باباى چاخۆرەوەش
عادەتی وایە کە چای لێبڕا سەری دێشێ و
وەڕەز دەبێ و وەزعی تێك دەچێ ، جا ئێمە
بوئەوەی کەس لەکاتی ناسك و دژواردا وە
لەگەرمەی جەنگدا تووشی سەرئێشەو
وەزع تێکچوون نەبین لەشێنەیەیی دا
واز لەچا دێنین .
دووەم : با هیچ کەس بەتەمای ئەوە نەیەتە
لای ئێمە کە مووچەو بژیوی ماڵومنداڵی
بۆ دابین بکەین ، چونکە ئێمە لەسەر لاقی
خۆمان را وەستاوین و پشتمان بەخوا و خەڵکی
موسوڵمان قایمەو لێرە کامتینی پارەی لێ
نادەین ، هەڵبەتە ئەگەر شتێکیش لەو

پارەیەی کە لە ( بیت المال ) دایە لـــــە مەسرەف و دابین کردنی پێدا ویستییەکانما زیادبوو ، هەوڵ دەدەین کێ زۆر موستەحەقە بەئەندازەی پێویستیی بیدەینێ ، بـــەلام نابێ کەس بەو ئەمایەوە بێت و دوایـــی دەستی لە بنی هەمبانەیەوە دەربچێ !!

سێیەم : بۆیە ئەم ناملیکەیەم ناونــا ( پێشمەرگەی ئیسلام ) نەك ( پێشمەرگـــەی مسولّمان ) ، چونکە ئێمە بڕوامان وایە کــە لەنێو حیزب و پێرو تاقمە غەیرە ئیسلامی کانیش دا ئینسانی مسولّمان هەیە ، بـــە پێچەوانەی پروپا گانتەی هەندێك کەســەوە ئێمە بەس خۆمان بە مسولّمان نازانیـــن ، بەلام جگە لەخۆمان هیچ پێشمەرگەیەکـــی دیکە بەپێشمەرگەی ئیسلام نازانین ، چونکە یەکەم : بەدوای حیزبێك کەوتوە کە بەرنا - مەکەی غەیری ئیسلامە ، دووەم : ئارەق و خوێن و بەرهەمی رەنج و خەباتی لەپێناوی ئیسلامدا نیەو ناچێتە گیرفانی ئیسلامەوە ، سێیەم : ئەگەر لەغەیری ئێمە بپرسی چ جۆرە پێشمەرگەیەکی ؟! نالّی ئیسلامیـــم ،

بەڵکو یان دەڵێ: پارتیم، یان دەڵێ:
یەکێتیم، یان دەڵێ: سۆشیالستم، یان دەڵێ
دیموکراتیم ..هتد .وە لەراستیدا هەرکا
- مێك لەوانە ئەگەر پێی بڵێی ئایا تۆ
پێشمەرگەی ئیسلامی؟! بەرووتدا هەڵدە
- شاخێو دەڵێ: نەخێر ئیسلامی نیم، فلان
پێرم!!

بەڵێ بەس ئێمەین پێشمەرگەی ئیسلام
چونکە ١- بەناوی ئیسلامەوە کاردەکەین و
دەجەنگین ٢- ئامانج و مەبەستی هەرەبەرز
- مان دوای رازی کردنی خوا، بووژاندنەوەو
نوێ کردنەوەی ئیسلامە، بەڵام پێرەکانی دی نا .
چوارەم : هەرکەسێك سەرپێچی یەکێك لەو
یاساو دەستوورانە بکات کە لەم
نامیلکەیەدا باس کران، مەگەر عوزرێکی
بەجێو شەرعی هەبێ دەنا وێرای تاوانبار
بوونی لەلای خودا، لەلایەن براگەورەو ...
لێپرساوانیشیەوە سزا دەدرێ، سزاش هەر
لە خۆلێ تووڕەکردنو سەرکۆنەکردنەوە هەتا
لێدانو گرتنو .. هتد دەڕوات .

کـــــــــۆتـــایـــــــــی

# نێـــوەڕۆك

## ئاگاداری

پێشنیاری دەکەم کە ئەم نووسراوە بکرێتە پەیڕەوو بەرنامەی راهێنان و بارهێنان و ژیان و گوزەرانی پێشمەرگەی دانیشتەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی .



چاپخانەی پێشەوای شەهید /
حسن البنا

ئەم نامیلکەیە

لێکۆڵینەوەیەکە لەبارەی پێشمەرگەی ئیسلامەوە، لەبەر تیشکی قورئانی گەورەو بەپێزو سوننەتی ڕابەری بەڕێزمان دا، بۆ ئەوەی (پێشمەرگەی ئیسلامی) ڕەسەن لەوانە جوێ بکرێتەوە کە لافی (ئیسلامی) بوون لێ دەدەن، بەڵام تاقەشتێک کە لە ئیسلامیان وەرگرتوە ناوی ڕووتەوە، بیروباوەڕو خوو و ڕەوشت و کردەوەو ئاکاریان و تەنانەت سەرو سیمایشیان هەتا بڵێی شتێکی لەگەڵ ئیسلام نەگونجاوو پووچ و بێ خێرو نابووتە.

نرخی ( ٧٥٠ ) فلسە